سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف
ELBEGI JAFF CULTURAL CENTER

زنجیرە کتێبی کۆچ

ژمارە ( )




و

# خوێندنەوە نوێکانی سەردەم

ساڵح سووزەنی

2006

**پێناسەی کتێب**

**ناوی کتێب**: نالی و خوێندنەوە نوێکانی سەردەم
**نووسەر**: ساڵح سووزەنی
**بڵاوکە**: سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف
**پیتچن**: بێگەرد ساڵح
**بەرگ و دیزاین**: حیکمەت مەعروف
**چاپی**: یەکەم
**ساڵی**: 2006

# ناوەرۆك:


پێشەکی

1. دیاردەناسی:
ا. فنۆمنۆلۆژیای شیعری
ب. ئانارشیزمی وەرگرتن یان راڤەکاری نوێ

2. نالی و جوانیناسیی کانت

3. ویتگونشتاین و یارییە زمانییەکانی نالی

4. بنەماخواز و خوێندنەوەی دەق


**پێشەکی**:

نالی و خوێندنەوە نوێکانی سەردەم لە راستیدا بۆ چاپ بە شێوەی کتێب نەنووسرا بەڵکو بە شێوەی وتارگەلی جیا بۆ ئەو کۆڕ وکۆبوونەوە و دیدارانە نووسرا کە لە کاتگەل جیاواز و دوور لەیەك لە لایەن کەسانی جیاوازەوە بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی نالی لە کوردستان سازکرا و لەو کۆڕانەدا خوێندراوەتەوە و لە چەند گۆڤارێکی کوردیدا بلأوکرانەوە .. بۆ وێنە نالی و دیاردەناسی سالی ( 2000 ) نووسرا وە و لە کۆنگرەی نالی لە شاری سەقز خوێندرایەوە و دواجار لە گۆڤاری ئایندەدا بلأو کرایەوە و.. نالی و جوانیناسی کانت، لەم دواییانەدا ( 2006 ) نووسرا و لە ( دیدارێك بۆحەزرەتی نالی ( ( لەلایەن سەنتەری روناکبیری ئێلبەگی جاف 2006/7/1 ) لە سلێمانی پێشکەشکرا.

هەربۆیە وتارەکان بە پێی گەلألە و یەکیەتی بابەتی تایبەتەوە دانەرێژراون و هەرکامەیان دەتوانن بابەتێکی سەربەخۆبن و بەگشتی بەو ئامانجەوە نووسراون کە ئاورێکی ئەمڕۆژیانە لە تێکستە کلاسیکییەکان بدەنەوە. بەتایبەت دەقی شیعری نالی، کە لام وایە دەقگەلێکی کراوەن و ئەو مەودایە ئەدەنە خوێنەری چالاك کە لە چەندین گۆشەنیگای جیاوازەوە بیانخوێنێتەوە، تیشك بهاوێتە سەریان و راڤەکاری و شرۆڤەیان بکاو... لە هەمانحالڵدا رێگا بۆ خوێندنەوەی دیکە لە بەرجەوەنێکی ترەوە خۆشبکا و هیچ یەك لەو خوێندنەوانەش بە سەرەکیتر لەوانی دی لەقەڵەم نەدا.

با ئەوەش بڵێم بە پێچەوانەی خوێندنەوەکانی پێشوو لەم خوێندنەوانەدا ئاوڕێکی ئەوتۆ لە چۆنیەتی ژیان و کەسایەتی و ساڵ و شوێنی لەدایکبوونی نالی و حەبیبە و سالم و... نەدراوەتەوە ئەوەش لای من ئاساییە بۆ وەی رەخنەی نوێ زێدەتر دەقی لا مەبەستە نەك قرم وقاڵی پەراوێز و شەڕەدەنووك لەسەر دۆزینەوەی مانایەکی تایبەت و نەگۆڕ بۆ دەق و .. بە قارەمان و حەزرەت ناساندنی شاعیر و ...

بەو هیوایەی توانیبێتم دەلاقەگەلێکی دیکە بکەمەوە بەرەو رەخنەی نوێ و دەقە شیعرییەکانی نالی شاعیر و جوانناسی کورد!


**ساڵح سووزەنی**

**سەقز**

2006/7/16

sozeni@yahoo.com


# دیاردەناسی

# فنۆمنۆلۆژیای شیعری

- ئەم وتارە بە پێچەوانەی وتارنووسیی باو، بە شێوەی بژاردەبێژی ( گوزین گوویە ) پێشکەش دەکرێ. ئەوەش تەنیا لە بەر نوێخوازی نییە، بەڵکو نەمویستووە بەر بە تەقینەوەی وێنە شیعرییەکان بگرم و بیانخەمە چوارچێوەی یەکیەتی بابەتی وتارەوە.
- بە رای من ئەگەر کوردەواری ئەوەندەی شاعیری باشی بوە و/هەیەتی/ئەوەندەش رەخنەگر و خوێنەر و راڤەکاری باشی هەبوایە، ئێستاکە دەبوا زانستی ئەدەبیی سەردەم و زۆربەی رێبازە رەخنەیی و راڤەکارییەکانی وەك رەخنە/ زماننناسی/ نیشانەناسی/ زمانیی/ فۆرمالیسم، بنەماخوازی زانیاری دەر/ هیرمنۆتیك /راڤەکاری/ رەخنەی کۆمەڵناسی ئەدەبی/ فمنیستی/مافی ژنخوازی و هەڵوەشانەوە و لەم دواییانەشدا رەخنەی پەسا مودێرن و... قەرزداری دەقە شیعرییەکانی نالی بوونایە، بە تایبەت دیاردەناسی شیعر و شاعیر، یارییە زمانییەکانی ڤیتگونشتاین و رەوتی نێواندەقێتی و..
- باوەکو غەزاڵە سرکەکانی نالی بۆ هیچ مانایەکی سەرەکی خۆ بە دەستەوە نادەن، بەڵام ئەگەر لە سەر لایەنێك لە ماناکان بڕیارێك درابێ بە پێی پێش ئیدراکێ بووە لە شیعرەکانی تری خۆی و زۆربەی ئەو شیعرانەش لەگەڵ وتارەکە پەیوەستە.

ئانارشیسمی شاعیرانە بریتییە لە هەوڵدان بۆ دەربازبوون لەو زمانە دەسەڵاتدارە باوەی لە سەردەمی شاعیر و پێشتریشدا سەپاوە و هەولی مانەوە ئەدا وەك هێزێکی سەرەکی مێژوویی، ئەدەبی– هونەری. لێرەدا شاعیر نایهەوێ لارەملی ئەو سیستەمە زمانییە بێ کە شاعیرانی پێش خۆی رەچاویان کردووە و وەك رەخنەگریش ( راپەڕینێکی بوێرانە ئەکا بەرامبەر ئەو زەواڵەی کە رەنگە لە قۆناخێکی تایبەتدا دەست بنێتە ئەوکی هونەر ) ئەوەش بە فۆرمی نوێی زمانیی نەبێ ناڕەخسێ. واتە بە بێ گۆڕینی فۆرمی زمانیی هیچ شاعیرێ ناتوانێ ئەو جیابوونەوە و دەربازبوونە بسەلمێنێ، ئاوڕدانەوەیەك لە دەقە شیعرییە دەوڵەمەندەکان و چۆنیەتی مانەوەیان تائێسا، چ لە رۆژهەڵات و چ رۆژئاوا، چشتێ نییە جگە مێژووی بەردەوامی ئەو دەربازبوون و جیابوونەوە زمانیی و فۆرمیانە ( نموونە ناهێنمەوە ئەگینا دەبێ باسی سەدان شاعیر بکەم ).

***

ئانارشیزمی وەرگرتن یا خوێنەرانە بریتییە لە هەوڵدان بۆ دەربازبوون لە بازنەی ئەو دەسەڵاتە راڤەکارییەی کە بەناوی دەقی رەخنەیی و بۆچوونی مێژوویی، سەپاوە بەسەر دەقەکاندا وخوێنەر بێئەوەی بیهەوێ ئەکەوێتە داویەوە. ئەرکی رەخنەی نوێ فۆکۆ گوتەنی دۆزینەوە و ئافراندنی ئەو راڤەکارییەیە کە مێژوو (وەك دەسەڵات و مەعریفە ) مەیدانی دەرکەوتن و گەشەی ئەداتێ و نەیهێشتووە سەقامگیربێ:

لابدە ( نالی ) لە ئـەنباری جیرایەی ساڵحان
گەرچی بیتە خۆشەچینی دانەیی خەرمانی رۆم

**دیاردەناسی شیعری هەوڵێکە بۆ:**

**دەربازبوون لە بازنەکا دەسەلآت - مەعریفەي میذوو**
**بۆ دەرخستن جوانکاري و ستاتیکا و ئەزموو راڤەکاري**

نوي ـ هةر بؤية دياردةناسان لة ثانتايي رةخنةي ئةدةبيدا طرينطي ئةوتؤ دةدةنة خوينةر و تيئوري وةرطرتن ـ خوينةري باشي ضالاك لاي ئةوان ئةو خوينةرةية كة لة كا خويندنةوة يان ديتنا، واز لة فةلسةفة و زانس ميذوويي خؤي بيـ و لةو تةقينةوة كاتييةي بكؤلَيتةوة كة وينةيةكي شيعري (بؤ وينة) لة دةروونيدا سازي دةكا..دياردةناسان هةروةها هةولَدةدةن خؤيان لة بؤضوو زيهـ «سوبذيكتيو» دوورةثةريز بطرن و لة ريطةطة عةيـ (ئوبذيكتيو) دةقةكة بةرةو خؤيان بطويزنةوة. ئةمة وةك دواجار باسي دةكةين ريضارةيةك بوو كة نا سةبارةت بة بابةتطة جياواز رةضاوي كردووة.

دیدەم هەموو شۆراوە بە شورئاوی سورشـــکم
لەو لەوحە نیگارینە نە عـەین و نەئەسەرما
***

کریشنا مۆرتی لای وایە لە هەر روانینێکدا سێ عامڵ (هۆکار)ی سەرەکی هەیە:

**یەکەم**: **خودی دیتن** Observation
**دووەم**: **ئەو کەسەی ئەڕوانێ، واتە** Observer
**سێیەم**: **ئەوەی لێیدەڕوانی واتە** Observed

مۆرتی ئەڵێ: ( نابێ هیچ مەودا (فاسڵە )یەك بکەوێتە نێوان ئەو کەسەی ئەڕوانێ و ئەو شتەی لێیدەڕوانی، بۆ وەی ( فاسڵە ) بەرهەمی زەمینە و پێشداوەری ئێمەیە و روانینێکە لە چاوی نەریت و میرات و رابردووەوە بۆ دیاردەکان ) ....

مۆرتی دەڵێ: ( ئەگەر بەو چاوەوە ئاوڕ لە دیاردەکان بدەینەوە شتەکانی بەو جۆرەی پێویستە نابینین )* ... بە واتایەکی تر چاومان دەبێ بشۆرین و بە جۆرێکی تر ببینین. ئەوەی کە سوهراب سپێهری ( لە شاگردەکانی مۆرتی ) بە دەیان جۆر درکاندوویەتی:

( من نمی‌دانم چرا می‌گویند
اسب حیوان نجیبی است
کبوتر زیباست
و چرا در قفس هیچ کسی کرکس نیست
گل شبدر چه کم از لاله قرمز دارد ... )

هەروەها بە رێز بەختیار عەلیش ئەم بۆ چوونەی لە شیعری جەلالددا رەچاو کردووە ... واتە پێش زەمینەی زیهنیی بەردەنگی لە مەڕ جەلالد گۆڕیوە و بە ڕای من ئەوە گرینگترین خاڵە کە لەپێناسەی شیعردا دەبێ لە بەر چاوبگیرێت.

نالی حەریــفی کەس نیە،
ئولف و ئەلیفی کەس نیە،
بەیتی رەدیــفی کـەس نیە
هەرزە نویـــسە گەپ دەکا

* . نگاهی به سپیهری. انتشارات مروارید

**به چاوی کەسانی تر دیتن، گومبوونه له ناو تارمایی مێژوودا و به کۆڵدادانی ئێسکی رزاوی مردووەکانمانه که پڕن له دووشت: بوغزورق یا خۆشەویستی و ئەوەش سەپاون به سەر دەقەکاندا . کەوایه به چاوی ئەوان دیتن دەبێته هۆی خراپ دیتن یا باش دیتن که هەر دوولا له روانگەی دیاردەناسەکانەوه هەڵەیه و نابنه شوێن دانانی راستەوخۆی وێنەکان له سەر رەوانی خوێنەر یا شاعیر خۆی[*] .**

**بێته حوجرەم، پارچه پارچەی موسوەدەم بکرێ به روح**
**هـــەر کەسه کۆتاڵ و پـــارچەی بێ بەدەل سەودا دەکا**
**شیعری خـــەڵکی کەی دەگـــاته شیعری من بۆ ناسکی**
**کەی له دیقەتتدا پـــــەتك دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا**

**باشلار له دیاردەناسی شیعردا دەڵێ : ( لێرەدا مرۆڤ دەبێ له وەرگرتنا لێهاتووبێ، واته گرینگی بداته وێنه له کاتی سەرهەڵداندا، ئەگەر بمانەوێ فەلسەفەیەك بۆ شیعر بناسین، ئەو فەلسەفەیه دەبێ له پێوەندی لەگەڵ بەندێکی شیعریدا بەرجەسته ببێتەوه و له پێوەندی تەواو لەگەڵ وێنەیەکی سەربەخۆدا بێ... وێنه یا (ئیماژی) شیعری تەقینەوەیەکی کتوپڕه که له رووپەڕی رەوانی مرۆڤدا دەردەکەوێ، جگه ئەوەش هیچ وتەزا ( مقوله )یەکی گشتی و رێکخراو ناتوانێ ببێته بنەمای فەلسەفەی شیعری. بەتایبەت ئەندێشەی ئەسڵ و هەوێنی سەرەکی رووخێنەر و وێرانگەره، بۆ ئەوەی دژایەتی هەیه لەگەڵ**

[*] برۆانه freedom from know یا رزگاری له زانین . کریشنا مورتی. له سەرچاوەی پێشوودا

**فعلییەتی رەوانیی و نوێخوازی، که بۆ شیعر حەیاتییه، بەڵام فەلسەفەی شیعر دەبێ ئەوه قەبوڵ بکا که کار/کنش/ی شیعر پێشینه هەڵنەگره، یان لانی کەم پێشینێیەکی نوێیه که دەتوانێ رەوتی بیچم وەرگرتن و سەرهەڵدانی تێدا رەچاو بکەین. به رای من پێوەری راستەقینەی توێژینەوه و هەڵسەنگاندنی بوونی / وجود/ وێنەی شیعری پێچەوانەی هۆکار / علیت / ه و له رووی تەقینەوه و دەنگدانەوەوەیه )[*]**

**ئاوی کەوسەر نۆشی سوفی بێ که من**
**ئاوی ئینسان یەعنی ئاوی لێو دەخۆم**

***

**نالی شاعیرێکی لێهاتووه که هەر دوو لایەنی ئافراندن و خوێندنەوه / واته رەخنەی / دژ به دەسەڵاته زمانییه باوەکانی نواندووه :**

**ا. له رێگەی زمانی تایبەتی خۆیەوه / سۆرانی، وشەگەلی فارسی، عەرەبی، تورکی .../ نامۆکردنەوه و بەرجەستەسازی گەیاندووەته ئەوپەڕی خۆی، ئەوەی که دواجار فۆرمالیستەکان ئاوەڕیان لێدایەوه.**

**ب. له رێگەی کێشی عەروزەوه که تا ئەوسا بۆ زمانی کوردی تاقی نەبووەوه دژی کێشی بڕگەیی، کەتا ئەو کات ببووه بنێشته خۆشه، هەڵسا و پێشانی دا زمانی کوردی نەك تەنیا ئەو توانایەی هەیه بەڵکو خۆی گوتەنی دەتوانێ مڵکی ئەوانیش داگیر بکا:**

**فارس و کورد و عەرەب هەر سێم به دەفتەر گرتووه**
**نالی ئەمـــڕۆ ساحیبی سێ مڵکـه دیـــوانی هەیه**

[*] . پدیدار شناسی شیعر. شلایر ماخر. ارغنون 14 ( برۆانه پەڕاوێزی1 )

ت. مەعریفەی دەسەڵاتداری سەردەم نەیتوانیوە نالی لە خشتەی خۆیدا ببەستێتەوە وەك دواجار پیشاندەدرێ ئەنگوستی ئیشارەتی نالی بە ئاگا و نائاگا بەردەوام رووی لە زەوییە نەك ئاسمان.

بە گشتی نالی گوێی نەداوەتە رابردوو، لە ئێستادا شیعر دەڵێ(گوتووە) وەك ئەوەی بۆ یەکەمجار دیاردەکان دەبینێ... ئەو هەروەها گوێنەداتە ئەو راڤەکارییەی تا ئەوساتە لەسەر شیعر هەبووە واتە ئەو خۆی گوتەنی بازی دیدەبازە نەك شەوارەی دەستەمۆ:

**لێم حەرامە دانە و و ئاوی حەماماتی حــەرەم**
**من کە بازی دیدە بـازم نەك شەوارەی دەستەمۆ**

ئەو دیوانەکەی بە جیلوەدەری حوسن و جڵەوکێشی تەماشاوە دەستپێدەکا: تەقینەوەی ئەم وێنەیە تەقینەوەیەکی ئاسایی نییە ... بۆ ئەوەی جیلوەدەری حوسن و جڵەوکێشی تەماشا، بۆن و بەرامی ئەرزی لێدا نەك ئاسمان:

بڕواننە خوازەی جڵەوکێش کە ناتوانێ ئاسمانی بێ ( بۆ ئەوەی باری سۆز و عاتیفی جڵەوکێش لە خوارەوەیە ). سەررشتەیی دینیش دێتەوە سەر دیتن، بۆ ئەوەی هەر سێ وێنەی سەرەکی ئەم دێرە دێتەوە سەر کاری دیتن، کە وایە دین لێرەدا ناتوانێ مانای دیتن نەبێ.*

هەروەها بڕواننە بازنەوشەی جیلوە/ حوسن/ تەماشا، رشتەی دیتن/ دین/ کە هەموویان بەرهەستن و ناچنە خانەی دەرهەست ( یا ئینتزاعەوە ).

* . بڕوانە پێشەکییەکەی، مامۆستا هێمن لە دیوانەکەی چاپی ( ئینتشارات سروە ) دا

بەیتی دووهەم: باخی گوڵ / خوازە بۆ روو/ میهر / خۆشەویستی، مل و لەعل/ خوازە بۆ لێو. دیسان دەگەڕێتەوە بۆ هەستی مرۆڤانە کە پێوەندی بە تەماشا و دیتنەوە هەیە . نالی لە بەر ئەوەی خوێنەر نەچێ بە لایەکی دیکەدا بە ئەنقەست لە مەسرەعی دووهەمی ئەو بەیتەدا وەك لەف و نەشر بەرامبەر گوڵ /شەوقی روخ و بەرامبەر میهر بزەی یاری داناوە کە زائیقە بەخشن، زائیقەش بۆ چێژوەرگرتنی بەرهەست دێ نەك دەرهەست وەك مەزە و .../ زائیقەش لە زمانی عەرەبیدا وەك لە دیوانەکەیشدا ( بەژێرنووس ) نووسراوە موئەننەسی ( مێی ) زائیقە و ئەندامی زائیقەش دیارە زمانە و زمان بۆ هەست و دەرکی ئاسمانی( واتە میتافیزیکی ) ناتوانێ بەجێ بێ ...

با دیسان بڕوانینە خشتەی بەرامبەرەکان:

**فەییازی**: **شەوق**
**ریازی گوڵ**: **روخ**
**میهر**: **زەوقی لەب**
**مل و لەعل**: **زائیقە بەخش**

دیارە خیتاب مێیە !

وێنەکان دیسان دەتەقنەوە و رەوانی مەش داگیردەکەن، بڕواننە:

جیلوەدەری حوسن / وێنەی یەکەمی بەیتی یەکەم فەییازی ریازی گوڵ یا / شەوقی روخ ومل و لەعلی، ئاوڕدانەوە و وەڵامدانەوەی ئەویش بەمیهری جەلال / واتە پێکەنین بە دەم نالیەوە / نە تەنیا نالی بەڵکو سوڵتان و شەهنشاش گێژ دەکەن دەیانخەنە هاتوچۆی سەرزەدەوە .../ زەڕڕاتی عکووسی کەششی میهری جەلالن بەمانایەکی تر ئەتوانێ هەر ئەم باسە بسەلمێنێ کە بە داخەوە لێرەدا بۆ ئەوە نابێ باس بکرێ.

سوڵتان و شەهەنشاش لە هیچ قامووسێدا موریدی جەلال بە مانا ئاسمانییەکەی نەبوونە و بەڵکو دایم بە دوای زائیقەوە بوونە ... ئەمانە هەمووی نیشانەن کە خوێنەری زیرەك دوای کەوێ و وێنە شیعرییەکان بداتە دەم یەك – هەڵبەت نە بەرەو ئاسمان بەڵکو بەرەو زەوی بۆ لای کەششی میهر و گەورەبوونەوەی ( پەرەسەندنی ) بۆ ئاواتی ماچ لە دێری چوارەمدا:

**جان بەر لەبی بووسەی لەبتە عاشقی زارت**

**فـــالبـــائس یستـــوهـــب من فیك معـــاشا** (داوای مەعاشت لێدەکا)

ئێستە زڕراتی عکووس ( وێنەی یەکەمی بەیتی سێهەم ) جان بەرلەب ( وێنەی یەکەمی بەیتی چوارەم )

فالبائس ( وێنە یەکەمی مەسرەعی دووهەمی بەیتی چوار بەراورد بکەن بۆ وەی سەری هەوداکەی نالیتان لێ ون نەبێ ... هەروەها دووپاتبوونەوەی لەب ( سێ جار ) زرووف ( هەر بە مانای لەب ) لە یەك بەیتدا لە باری نائاگایی هۆش و هەستەوە ئەسەپێ بە سەر بائیسدا و بە زۆریش بووە ئەیکا بە باس واتە ماچکەر / هەر چەند ئەگەر بە مانای ناهومێدیش بیخوێنینەوە هەر هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ.

نالی لەم شیعرەدا دەسکاری زمانی دەسەڵات ئەکاو بە ئیزافەکردنی گوڵ بە لاحەول سەر لە نوێ راپێچمان ئەکاتەوە بۆ ئەرز. دواجار وەك ئەوەی ئاگاداری دەسەڵاتی راڤەکاری سەردەم بێ و ئەزانێ کە خوێنەر رەنگە بخرێتە سەر رێگەی جاران، حوجەتی خۆی تەواو ئەکا. نییەتی نالی سیحری بەیان و حیکمەتی شیعرە و بەس، بەڵام قووەتی دڵی نییە و ئەترسێ و قودرەتی ئینشاکەی هەر ئەوەندە ئەتوانێ بڵێ:

**نالی نییەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە**

و لەوە زیاتر. سەرداری لە دوایە /

**ئەمما نییەتی قووەتی دڵ قوودرەتـــی ئینشا.**

***

## دیاردە ناسی

## ئانارشیزمی وەرگرتن یان ڕاڤەکاری نوێ

**پێم دەڵێن مەحبووبە خێڵ و ڤیچە مەیلی شەڕ دەکا**
**خێڵ و ڤیچە یا تەرازووی نـــازی نەختێ ســەردەکا!**

نالی بە دوو شێوە ئاوڕی لەو بابەتە داوەتەوە: یەکەم وەك بەم دێڕەدا دەرئەکەوێ ڕوانگەیەکی دیاردەناسانەیە واتە خۆی خستووەتە جێگەی بینەر /خوێنەر – موخاتیبەوە/ و بە چاوێکی شۆڕاو لە هەموو ئەزموونەکانی ستاتیکا ئاوڕی لەدیاردەکان/ لێرەدا چاوی خێڵی مەحبووبە/ دراوەتەوە، نەك وەك ڕاڤەکاران و شاعیرانی پێشوو کە لایان وابوو تەنیا کۆتر جوانە و بەس/ وەك لە پێشەکی ئەم وتارەدا باسکرا، نالی لە چاوی خۆیەوە چاوی مەحبووبە ئەنوێنێ و ڕێگەیەکی تر دەخاتە بەردەم جوانناسی سوونەتییەوە.

**خێڵ و ڤیچە یا بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بە چاو**
**مەیلی ڕاست هـــاوێتنی موژگانی دڵ پەیکر دەکا**

نالی بەمجۆرە ئەیسەلمێنێ گوڵی شەبدەر / بۆ وێنە/ نە تەنیا هیچی لە گوڵاڵە سوورە و وەنەوشە و نیلووڤەر لە باری جوانییەوە کەمتر نییە بەڵکو سەرتریشە/ سەرنج بدەنە ئەوەی کە سوهراب سپێهری دوو سەدە دوای نالی شتی وای گوت و بوو بە کەڵە شاعیر:

**چـــــاوی هەمرەنگی گوڵی مەستی شەو و ڕۆژن مەدام**
**یەك لە نەشکوفتەی وەنەوشە و یەك لە نیلوفەر دەکا**

دوای تەقینەوەی وێنەی سەرەکی و سەلماندنی ئەوەی کە ***چاوی مەحبووبە بە خێلیش هەر جوانە*** ئانارشیزمی وەرگرتن دەبێتە ئانارشیزمی هێرشکەر: دژ بەو دەسەڵاتە ڕاڤەکارییەی کە تا ئێستا وەك

تووتی هەر شتی دووپاتکردووەتەوە و هەوڵی ئەوەی داوە کە دیاردەکان لە خۆیانا بتوێننەوە، پێشتر خۆی فەرموویەتی:

**توتیی تۆ لەحیرسی دڵ داوی تـەمـەع دەکاتە مـل**
**بولبولی من لە ئەشقی گوڵ تەغنیە و تەرەب دەکا**

نالی لێرەدا نەك هەر سەف خۆی لەگەڵ تووتیبێژەکان جیا ئەکاتەوە بەڵکو وەك کەج نەزەر هێرش دەباتە سەریان کە چووزانن خوار و ژوور کامەیە:

**عەکسی چـاوی تۆ لە چـاویدا بە خـــــواری تێدەگەی**
**کەج نەزەر، کەی فەرقی خوار و ژوور و خێر و شەڕ دەکا**

شۆڕشگێڕی نالی لێرەدایە کەدەردەکەوێ، بریا مامۆستا هێمن لە جوابی ئەو کەج نەزەرانەدا کە گوایە نالییان بە ( زمانباز ) ناو بردووە*، باسی زمانبازی نالی وەك ئازایانەترین زێبازی ئەدەبی لە بەشی دووهەمی ئەم وتارەدا دێت و ئەوەش با بمێنێ بۆ جێگەی خۆی، ئەمانەی بگوتایە کە: شاعیران، شۆڕشگێڕانی راستەقینەی جیهانن، ئەوەی رووبەرووی دەیان دەسەڵاتی قەبە دەبێتەوە و دەڵێ نا، ئیجگار لەو سیاسەتبازە دەمامك لە چاوانە شۆڕشگێڕترن کە تەنیا دروشم ئەدەن و هەر تاوێ کاسەلێسی پاشایەکەن ... کەچی نالی تاقە موویەکی تووڕەیی یار ناگۆڕێتەوە بە هەزار تووڕەیی پاشایەتی و تەوقی وەزارەت:

---

* . نالی هەموو ئەو کەسانەی کە بەناوی دینەوە ریادەکەن دەکوتێ: سۆفی، شێخ، واعیز، زاهید. تەنانەت مەلا وەك: لە پەراوێزی ژمارە ( 2 ) دا چەند نموونەیەك بخوێنەرەوە.

**شـــــــایستەی شان لایەقی مـل تووڕەیی تۆیە**
**نەك تووڕەیی شاهەنشەهیی و تەوقی وەزارەت**
**کێ دەستی دەگـــاتە بەی و ناری نەگەیشتووت**
**لەو تەختە کـــەوا ساحیبی مۆرن بە سەدارەت**

بە دەیان نموونەی تری وا نالی وەڵامی ئەوانەی داوەتەوە:

**هەر کەسێ نوقسانی خۆی باوێتە سەر رووی ئاوێنە**
**شـــاهیدی هەر چەندە ( رای العین ) کێ باوەڕ دەکـا**

ئەوەی رووی ناحەزان لە ئاوێنەی چاوی قیچی یاردا ئاوەها بە جوانی پێشانئەدا چۆن ئەتوانێ شۆڕشگێڕ نەبێ؟ شۆڕشگێڕی لە شکاندنی بازنەی دەسەڵاتی زماندایە و چاوی نالیش وەك چاوی مەحبووبە بە راستی شاهێنە و داییم سەر دەکا و لە هیچ ناگوزەرێ:

**نالی ئەو وەحشی غەزاڵە کەس ئەبەر داوی نەکەوت**
**چـــونکە شاهێنی دوو چاوی تیژە داییم ســەر دەکا**

نالی نیچە ئاسایان بە پێچەوانەوە شمشێر لە ئاسمان ئەسوێ و عرفانییەت و تەقەدوسی ئەشقی خانی دێنێتە خوارەوە ... بە داخەوە ئەوەی شیعری مەستوورەی تائێستا خوێندووەتەوە ئاوڕی لە گرنگترین مەسەلە نەداوەتەوە کە:

ئەشقی زەوینی و بێ ریایی نالی لە ئەشقی واعیزان و سۆفیان و زاهیدانی دەمامك لە چاو و درۆزن موقەددەستر و شاعیرانەترە لەوانەی خوی گوتەنی:

**ریشـــەکەی پان و درێژە و بۆ ریا خزمەت دەکا**
**زاهیرە هەر چەن بە توول و عەرزی ریشیدا ریا**

ئەو بە مەیی کۆنە لە سەر عادەتی نەو یەکجارەکی دووسەد ماتەمی تەوبە دەشکێنیٚ:

**ئەی واعیزی بارید چییە هەر وەك هەرەسی کێو**
**بەو وەعزە کە بایە هەموو هاتوویی بە سەرما**
**بۆ هەرکەسە مەبزوولە تەریقێکی ئەمانەت**
**هــــەر ئاشقی بێچارە لەرێی خەوف و خەتەرما**

بۆ دەمامك لە چاوان مەترسییەك نییە لە ئارادا بۆ ئەوەی دەمامك زۆرە و لە کاتی پێویستا هەر کامیانی پێخۆش بیٚ دەیکاتە چاو... / یان دەیکەنە چاویان/

تەنیا عاشقی شۆڕشگێڕ و شاعیری بێچارەیە کە بەردەوام لەمەترسی و خەتەری چارەنووسی هەڵلاجدایە.

پول ریکۆر سەبارەت بە رەخنەی دیاردەناسانە دەڵیٚ: ( دیالێکتێکی نێوان پێش ئیدراك و پێش داوەرییە )، پێش ئیدراکی من بۆ ئەم قسە هەر شیعرەکەی نالی خۆیەتی:

**سورشکم نەقــــشی چاوی تۆ دەکێشیٚ**
**جێگام سەردارەکەی مەنسوورە ئەمشەو**

نالی بۆ بە زمانی سۆرانی شیعر دەڵیٚ؟
نالی بۆ کێشی خۆماڵی بە کارنابا؟
نالی بۆ ئەوەندە وشە ئارایی دەکا و لە هیچ وشەیەك ناپرینگێتەوە؟ و ...

بۆ ئەوەی نالی ئەیەویٚ شاعیر بیٚ و فەننی شیعر لە هەر کویٚ بیٚ بە هی خۆی ئەزانیٚ ... بۆ وەی نالی نایەویٚ تووتیبێژ بیٚ .. بۆ وەی نالی ئەیەویٚ رچەشکێن بیٚ نە سیایی لەشکر ... بۆ وەی نالی ئەزانیٚ لە پانتایی ئەدەبدا تەنیا یەکمان هەیە و کاری ( خارق‌العادە ) ئەگینا دوو و سیٚ و .. تاد دۆڕاندوویانە و تەنیا شاسوار لە عەرشەی ئەدەبدا دەمێنێتەوە:

**یا لەمەیدانی فەساحەتدا بە میسلی شەهسوار**
**بیٚ تەئەموول بەو هەموو نەوعە زمانی رادەکا**
**نالی یەك و ئەو کەس کە تەمامی غەزەلی بیست**
**مەعــلوومی بووە زۆر و کەمی خاریقی عــــادات؟**

***

**پەراوێز:**

1) «شەوقی کە نەبیٚ باسیرە مەئیووسە لە دیتن!
هەر شەوقی ئەوە قووەتی دینی بەنەزەردا»
یا «چاوێکی لە نالی کرد، دین و دڵ و جانی برد
گەر زوڵفە ئەگەر نازە گەر خەندەیە گەر چاوە»
«تۆ کە حۆریت وەرە ناو جەننەتی دیدەم چ دەکەی »
یا «نالی وەرە لادە لە خەدەنگی موژەیی یار
ئەو کافرە مەستانە کە غارەتگەری دینن»

2) ئەی سۆفی سافی مەبە ئالوودە بە دنیا
بێهوودە موکەددەر مەکە سەرچاوەیی مەشرەب /کە لێو بیٚ/
شێخی‌یوو سەراپا دەلەك و رێوی دەپۆشی

ناليم و بەرووتی لە هەموو دیدە دەپۆشم

ئەمە جێی رەمز و ئیشاراتی دەروونە لە گەرووی
تەنگی پڕ غەرەغەرەیی واعیزی غەڕڕا نییە باس

سۆفی لە فەقر و فاقە وەکوو ناقە فاقی دا
تەسبیّحی دام و  دانە بە ریشی دوو فاقی فاق

سۆفیان هاتنە مەیدان وەرەقی دیدە بشۆن
لە کن ئەو دێمیە وشکانە لە دەریا نییە، باس

یاخۆ بووە بە سۆفیی وشکی لە حەق بە دوور ....

# نالی و جوانیناسیی کانت

(1)

**بیدی مەجنوونە وجوودم لە هەموو بەر بەرییە**

**نە کەسێ مونتەفیعی یەك بەری یان سێبەرییە**

**چـــیت لە کاکۆڵی سەر و مـــوویی میانی داوە**

**هەموو هەر هەم و پەرێشانیی و دەردیسەرییە**

**بە ریا باری تەکالیفی رســـــوومی بۆ خەڵك**

**چ دەکێشی؟ ئەمە حـــومقێکە عەلاوەی کەرییە**

**موتمەئین خاتر و ئیمەن مەبە هەرگیز لە شەڕی**

**نەفسی ئەممارە کە ئەم مارە لەگەڵ تۆ شەڕییە**

**لـــۆمەیی نالییی دێوانە مەکەن ئەی ئوقەلا**

**ئەمە مودێکە زەدەی لە تمەیی دەستی پـــەرییە**

ئەمــە رەنگــە پرســیاری زیهــنی هــەمووومان بــێ کــە، کەڵەشاعیرانێکی وەك نالی چۆن شیعر و لە راستیدا جوانیناسییان پێناسەکردوە و ئەو هەموو کایە زمانییەیان بە پێی چ پێناسەیەکی دەروونــی یــان عــەینی و بــەدەقکراو هــەبووە؟ چــۆن راســتەوخۆ و ناراستەوخۆ کردوویانەتە پرۆسەی تێئۆری دەق و دواجار ئەوەند ئەو پێناسەیە سەقامگیر یان نەهادینە دەبێ کە ئەو باوەڕە وەها لەگەڵ یەکیەتی بابەتەکەیان تێکەڵاو و ئاوێتە دەبێ، کە بەس خوێنەرانی چالاك دەتوانن لە ئانالیزی تێکستەکەیاندا راڤەکاریی بکەن.

تۆ بڵێی کەسانی وەك نالی کە ئەو هەمووە ئالوودەی شیعر دەبن رۆژێ لەرۆژان بیریان لە پرۆژە یان پرۆگرامێکی جیاواز نەکردبێتەوە و لە هەوڵی پێڕەویکردنی ئەو پرۆژە شیعرییەدا نەبووبێتن؟

نالی لەو شاعیرانەیە کە بەردەوام وردکارییە زمانییەکانی ئەداتەوە بەناوچاو خوێنەراندا و لە زۆر تێکستی شیعریدا دڵنیایە کە کەم کەس توانای دەرك و لانی کەم بینینی زۆربەی ئەو زەریفکاریانەی هەیە و ئێستاکە پاش دووسەدە و *ئەوەندە* ساڵ و دوای ئەو هەموو ( پەلەقاژە ناشیانەیە )/ قسەی مەسعوود محەممەد لە زمانی هێمنەوە/ لە خوێندنەوەی دەقەکانی نالیدا بەو ئەنجامەدەگەین کە نالی مەبەستی خۆهەڵکێشان نەبووە و سەرەندەری ئەو هەموو وردە داوگەلە کاری یەك کەس و چەند کەس نییە ... و رەوتی رەخنە و راڤەکاریی جیهانیش ئەم راستییەی درکاندووە کە خوێندنەوەی شیعری کەڵە شاعیرانێکی وەك نالی، بەس لە یەك گۆشەنیگاوە، دەمانخاتە ( غەڵەتاوە ) کەی نالی خۆیەوە.

**پێشتر** لە وتارگەلی ( نالی و خوێندنەوە نوێکانی سەردەم ) دا هەوڵمدا لە روانگەگەلی نیشانەناسانە، دیاردەناسانە و گەمەزمانییەکانەوە ئاوڕێك لە شیعری نالی بدەمەوە و ئێستاش لەسەر ئەو باوەڕەم کە غەزاڵە سرکەکانی شیعری نالی بە هیچ لەونێك ناخرێنە تۆڕی مانایەکی تایبەتەوە. بۆیە لێرەدا هەوڵئەدەم لە ئانالیزی شیعرێکی دیکەیدا ( کە تا ئێستا ئاوڕێکی ئەوتۆی، جگە ماناکردنەوەی فەرهەنگ و وشەیی‌یانەی روالەتی، لێنەدراوەتەوە ) بچمەناو بابەتێکی دیکەوە کە رەنگە بە بۆچوونێك گرینگترین بابەت بێ بۆ کردنەوەی دەقی شیعریی نالی، ئەویش چونیەتی روانینی نالی بووە لە غەزاڵەکانی خۆی( یان پێناسەی خۆی بۆ شیعر ) و لەو رێگەوە ئەمهەوێ پردێکی پێوەندی ساز کەم لەگەڵ روانینی ستاتیکیانە و رەخنەگرانەی سەردەم!

ئانالیزی دەق، ئەوەی لە خوێندنەوەی یەکەمی ئەم شیعرەدا دەرئەکەوێ گرینگیدانی نالییە بە گۆشەنیگا و چۆنیەتی کەڵك وەرگرتن لەو تکنیکە لە دەقی شیعری‌دا:

1. **گۆشەنیگای من ( یەکەم کەسی تاك )**:

**بیدی مەجنوونە وجوودم لە هەموو بەر بەرییە**

**نە کەسێ مونتەفیعی یەك بەری یان سێبەرییە**

2. **گۆشەنیگای سێهەم کەسی تاك**: **بەردەنگی ئەم گۆشەنیگایە کەسی غاییبە**:

**چیت لە کاکۆڵی سەر و موویی میانی داوە**

**هەموو هەر هەم و پەرێشانیی و دەردیسەرییە**

3. **گۆشەنیگای دووهەم کەس" کە منی تێدا دەبێتە بەردەنگی ئامادە و رووی دەمت لەو یان خود دەبێ**:

**بە ریا باری تەکالیفی روسوومی بۆ خەڵك**

**چ دەکێشی؟ ئەمە حومقێکە عەلاوەی کەرییە**

**موتمەئین خاتر ئیمەن مەبە هەرگیز لە شەڕی**

**نەفسی ئەممارە کە ئەم مارە لەگەڵ تۆ شەڕییە**

4. **گۆشەنیگای زیهنیی شاعیر**: کە رووی دەمی لە ئەوان (عوقەلا)یە و گرێی مانایی و پێکهاتەیی شیعرەکەش لەم دیڕەدا دەکرێتەوە بۆ وەی شاعیر لێرەدا وەك من ( منۆلۆگ ) قسەناکا و منی دێڕی یەکەمیش لە خوی دەسڕێتەوە:

**لۆمەیی نالییی دێوانە مەکەن ئەی ئوقەلا**

**ئەمە موددێکە زەدەی لە تمەیی دەستی پەرییە**

ئەوەی ئاشنای کایەکانی ئەدەب بە گۆشەنیگا بێ، دەزانێ کە هەر کام لە گۆشەنیگاکان لە بەر دەسەڵاتی تایبەتی خۆیان بۆ نواندنی

دیاردەکانی دەوروبەر و هەستە دەروونییەکان گرینگایەتی ئەوتۆیان هەیە، واتە گۆشەنیگای یەکەم کەس بۆ دەربڕینی سۆز و عاتیفەی دەروونی و بەگشتی دەروونییات سروشتی ترە و گۆشەنیگای سێهەم کەس کە بە زانای گشتی بە ناوبانگە بۆ چوونە ناو دەروونی کەسایەتی ناسروشتی دەنوێنێ، بەلأم توانای پێوەندیدانی بە دیاردە و کەسایەتییەکانی دەوروبەر و دوورتریش، زێدەترە و گۆشەنیگای دووهەم کەس لە بەر ئەوەی بەردەنگ ئامادەبوونی هەیە دەبێتە دەنگی دووهەمی منی تاك یان دیالۆگی خود و من و .. نالی بە جوانی و بە ئەنقەست ئەم گۆشە نیگاگەلەی لەم کورتە شیعرەدا بەکارهێناوە بۆ ئەوەی:

ا. شارەزایی خۆی لەو بوارەدا بێنەتە ئەزموون و نوێخوازبوونی خۆی ( لەو سەردەمەدا ) بسەلمێنێ و بەراستیش سەلماندوویەتی.

ب. سەرنجی خوێنەر بەرەو راوی ( گێڕەرەوە ) کان راکێشێ بۆ وەی بزانن کێ لەگەڵ کێ قسەدەکا و رووی دەمی کێ لە کێیە؟ راموایە ئەگەر خوێنەر ئەم مەبەستەی بۆ روون نەبێتەوە، شیعرەکەش ناپێکێ و جیا لە جوانکاری و تکنیکی نوێ بۆ توێژی دووهەم و سێهەم و ... ی دەقەکەش رێنموون نابێ. هەروەها کە لە ژێرنووسی دیوانەکەشیدا دەبینین شیعرەکە بە راستی نەپێکراوە .. نالی لەگەڵ کێ قسەدەکا، بەردەنگی نالی کێیە چ کەسانێك بەردەنگی نالین؟

لە خوێندنەوەیەکی دیکەی شیعرەکەدا، بە سەرنجدان بە بازنەی وشە یان دەستە واژەکان دەبینین کە نالی لە دێڕی( 3 و4 )دا، و ( عۆقەلا و پەری ) لە دێری کۆتاییدا دەوری بەردەنگ دەگێڕن. واتە نالی بەردەنگی عوقەلایە لە لایەك و لە لایەکی دیکەوە بەردەنگی پەرییە، بەو پێیە عوقەلا و پەریش دەبنە بەردەنگی نالی.

لێرەدایە کە کەڵکوەرگرتنی نالی لە گۆشەنیگا ئاشکرا دەبێ ( من و خودی لایەنگری شیعر و کێشمەکێشی نێوانیان وەك بەرەی عەقڵ و بەرەی هەست و..) خوێنەر دەخاتە ناو داوێکی دیکەوە بۆ دۆزینەوەی خوازەی پەری.

ئەگەر نالی لە خشتەیەکدا بە پێی ئەو گۆشە نیگاگەلە بکێشینەوە دەبینین کە لە دوولاوە بەم چەشنەی خوارەوە بوەوتە بەردەنگ:

عوقەلا(یان بەشی سەربە عەقڵی زیهنی شاعیر)

↓

نالی

↑

پەری (دەروونیات، جوانی، نەفسی ئەممارە و..)

ئێستە بە سەرنجدان بە لیستەی خەتابەکان، لەوانەیە بتوانین خوازەی پەری ئاشکرا بکەین:

1. خەتابی پەری سەرەتا لەگەڵ خۆی ( دێری یەکەم بە گۆشەنیگای یەکەم کەس.

**بیدی مەجنوونە وجوودم ...**

2. خەتابی پەری بە شاعیر ( کە نالی بێ ) یان بە پێچەوانەوە دێری دووهەم، گۆشە نیگای دووهەم کەس.

**چیت لە کاکۆڵی سەر و موویی میانی داوە ...**

3. خیتابی عوقەلا ( یان بەشی سەربە عەقڵی زیهنی شاعیر ) دێری 3و4.

**بە ریا باری تەکالیفی رسوومی بۆ خەڵك**

**چ دەکێشی؟ ئەمە حومقێکە عەلاوەی کەرییە ... تاد**

4. خیتابی نالی راستەوخۆ بە عوقەلا و ناراستەوخۆ بە پەری (گۆشەنیگای زیهنیی بو ئەوان ) لە دێری کۆتاییدا:

**لۆمەیی نالیی دێوانە مەکەن ئەی عوقەلا ...**

ئێستە ئەگەر پەری( بە کاکۆڵی سەر و موویی میانەوە، بەرینەوە سەر  بیدی مەجنوون بەو هەموو زەرافەت و جوانییەوە، تێدەگەین کە پەری هەمان  شیعرە کە نالی لە لایەکەوە گیرۆدەی پرۆژەکەی ئەوە و لەلایەکی دیکەوە گیری عەقڵ و عوقەلایە:

**پای استدلالیان چـــوبین بود**

**پای چوبین سخت بی تمکین بود**  ( مولوی رومی )

کەوایە ئەم شیعرە چۆنیەتی تێکەڵبوون و بەرەنگاریکردنی نالییە وەك شاعیر لە گەڵ عەقڵ و مەنتیقی ئیستدلالی لە لایەك و شیعر و هونەر و جوانیناسی لە لایەکی دیکەوە.. بەو پێیە خشتەی پێکهاتەیی و مانایی شیعرەکە لە توێژی دووهەمیدا بەشێوەی خوارەوە دەگۆردرێ:

**( عەقل ) و مەنتیقی ئیستدلالی**

↓↑

**شاعیرو جوانیناسی**

↑↓

**شیعر و هونەر**

ئەنجام لـەم کێشمە کێش و ململانێیـەدا شاعیر لایـەنی شیعر و هونەر دەگری و لادانی لە ڕێگەی عەقڵ دەخاتە ئەستۆی پەری شیعر*

لـۆمەیی نالـــیی دێوانە مەکەن ئەی ئوقەلا

ئەمە موددێکە زەدەی لە تمەیی دەستی پەرییە

(2)

وەك دەزانین لە دوو سەدەی رابردوودا باوەکو ناو بە ناو هێندێ تیۆرەی نە زۆر بەربڵاو لەلایەن رەخنەگرانەوە لە سەر سەربەخۆیی هونەر بڵاوکرایەوە بەڵام سیستەماتیکترین تیۆرە لە لایەن کانتەوە لە کتێبی ( رەخنە لە داوەری ) / نقد قوە حکم/ دا بڵاوکرایەوە. لەو کتێبەدا کانت گرینگی زۆری دایە ( غایەت ) یان غەرەز / zwE C k کە بە رای ئەو بوونێکی سەربەخۆی هەیە لە خواست یا مەیلی مرۆڤ. کانت پیی وایە / غائیت / دەتوانێ بێغەرەز بێ..

* . لە راستیدا من و خود و بەرزەمنی نالی لەم شیعرەدا یەکیان بە نوێنەرایەتی عەقڵ و بەئاگا و یـەکیان وەك نەفسی شـەیتانی و ئـەمارە و نوێنـەری ئـەم مـارە( بـە خوێندنـەوە فرۆیدییەکـەی) هەریەکیان لایەنگەلی تەبایی و ناتەبایی و بەینابەین (دێوانەیی) هاتوونەتە ئاخاوتن و پێکهاتەی فورمی و مانایی شیعرەکە دەنێنەوە و ئەمە ش توێیەکی دیکەی مانایی شیعرەکەیە کە مەبەستی ئەم وتارە نیە.

کورنێر راڤەکاری گەورەی بەرهەمەکانی کانت سەبارەت بەو گوتەیە دەڵێ:( ئێمە زۆر جار شتگەلێك دەبینین / چ ئەوانەی دەستکردی مرۆڤن، چ شتی تر / ئەوەندە ئەجزایەکی خاوەن ڕێژە و ڕێکوپێکیان هەیە کە بە گشتی وەك شتێکی گەلآلەدار / تەرحدار/ دێنە بەر چاو، بێئەوەی بیر لەو هۆکار و ئامانجە بکەینەوە کە خاوەنەکەی بۆی داڕشتووە یان مەبەستی بووە. تەنانەت هەرگیز بیریشی لێناکەینەوە کە کێ و بۆ چ مەبەستێ سازیکردووە. کانت پێیوایە جوانی جۆرە مەبەستێکە / غائیەت/ کە بێئەوەی مەبەستەکە لە بەرچاوبگرین دەناسرێتەوە یان دەرکدەکرێ. بە رای ئەو کۆی مەبەستمەند/ کل هدفمند/ لە دوو لایەنەوە دەبینرێ:

**یەکـەم**: ئەوەی کە بمانهەوێ ئەو شتە لە رەهەندی ئامانجخوازییەوە ببینین.

**دووهەم**: هەر ئەوشتە بەپێی زەوق و سەلیقەی جوانناسانە هەڵسەنگێنین. ئەگەر وەك گەیشتن بە قازانج و کارکردی شتەکە تەماشا و پەسەندی بکەین ئەوە مەبەستخوازین و ئەگەر ڕێژە و تەبایی نێوان پاژەکانی ئەو شتە بە پێی زەوق و سەلیقەی جوانناسانە هەڵسەنگێنین، بێ ئەوەی ناوەرۆك یا چەمکێکی پێوە ببەستین ئەوە داوەرییەکی جوانناسانەمان کردوە.

سەرچاوە: ( فۆرم چیە ) حشمت علایی.

S. KornE r KA nT 1967 pp181- 2 184- 185 /

کانت له بەشی دووهەمی «رەخنه له داوەری»دا بەم جۆره شیکاری شتی جوان dAs sChonE دەکا: ئەو چێژه که بوونی واقعی شتەکانمان وەبیر دەخاتەوه قازانج یان قازانجێتیه و ئەو هەستەش لەگەڵ مەیلی مرۆڤدایه. کاتێ پرسیارێ سەبارەت به جوانی بێته ئاراوه مەبەست ئەوه نییه که بزانین لەگەڵ بوونی راستەقینەی شتێکدا رووبەروو ببینەوه یا نا؟ بەڵکو مەبەست ئەوەیه که روونی بکەینەوه دوای دیتنی ئەو شته جوانه و دوای تێڕامان/ تامل / bETrAChTong چۆن قەزاوەت / داوەری / دەکەین.

گرینگ ئەوەیه که، دوای خۆنواندنی blossE vorsTEllung شتەکه ئەو شتەم لاپەسەند دەبێ یا نا... دیاره بۆ ئەوەی شتێکمان لاجوان بێ و نیشانی بدەین که خاوەن زەوق و سەلیقەین دەبێ چۆنیەتی خۆنواندنی شتەکه له بەرچاو بگرین نه ئەو هۆکارانەی که بوونی راستەقینەی شتەکان ئەنوێنن. هەموومان دەبێ ئەوه بزانین که داوەریکردن سەبارەت به جوانی ئەگەر تۆزاڵه قازانجێکمان له بەرچاو بێ داوەرییەکی بێ غەرەز و بێ لایەن و/ لەرووی دڵپاکییەوه/ نییه. نابێ کەمترین لایەنی جوانی شتەکان له کیس بچێ، بەڵکو دەبێ به راستی بێ لایەنی خۆمان بپارێزین بۆ وەی داوەرییەکانمان زەوق و سەلیقه به سەریدا زاڵ بێ.

کانت، رەخنه لەداوەری/ ل 13

کانت له درێژەی باسەکەیدا زەوق به ( هێزی داوەری /bE urThE Ilungs vE rM ogE n/ دەناسێنێ و شتی جوان یا جوانیی بەوه دەزانێ که هیچ چەمکێ نەتوانی داگیری بکا و زۆربەی خەڵك چێژی لێوەر بگرن. به رای ئەو، چێژ وەرگرتنیتەواو له جوانی ئەوه دەسەلمێنێ که جوانی به بێ خێر و قازانج دێته هەڵسەنگاندن و ئەگەر سوودی تاقەکەسی له ئارادا نەبێ جەماوەر به گشتی له بەرەی چێژ کەڵوەردەگرن..

فەلسەفەی جوانناسی کانت، که به رای هێگل یەکەم گوتاری عاقڵانەیه له پانتای مەعریفەی مرۆڤدا، بەرهەمی توێژینەوەی دەرهەستانه / انتزاعی /یه لەسەر بابەتگەلی/ جوانی . راستی و . . هەر بەو جۆرەی که کانت خۆی له سەرەتای /بەرهەمە ناو براوەکەیدا/ دەڵێ دەتوانین دەسەلات و لێهاتوویی رۆحی مرۆڤ بکەینه سێ بەشەوه:

ئـــیراده　　هـەســـت　　ئەندیشه

واته:

هێزی مەیل　هەستی چێژ و رەنج　هێزی مەعریفی

که لەگەڵ عەقل و داوەری و دەرکدا تەبان/ هاورێژەن /:

ا. دەسـەڵاتی مـەعریفی یـا شوناسـی مرۆڤ کـه لـه فیکـردا خـۆی دەنوێنێ، ئامرازێکه بۆ ناسینی نـەزەری جیهـان و گەیشتن بـه راستی و

حەقیقەت. کە وایە گەڕان بە دوای راستیدا دەچێتە ئەو بەشە لە رۆحی مرۆڤ کە لەکێشە نەزەرییەکان رادەمێنێ.

ب. عەقڵ کە چاو دێری چاکە دەکا و لە پانتایی کارکردی مەیل و ئیرادەی مرۆڤدا خۆی دەنوێنێ و ..

ج. جوانی کە دەچێتە ئەو بەشەی کە، لە عەقلی کارکردی و رامانی نەزەری بە دوورە، ئەویش سنوورێکە لە نێوان ئەو دوانەدا کە نە بە شوێن پرسیار و وەڵامەوەیە و نە بەدوای کارکردا دەچێ..

مەبەستمەندیی بێ غەرەز و چێژی دوور لە قازانج، واتە بنەما سەرەکییەکانی سیستەمی جوانناسی کانتی( لێرەدا بیدی مەجنوونەکەی نالیتان لە بیر نەچێ) هەر دووکیان لە فەلسەفەکەی خۆیەوە وەرگیراون کە لەسەر دوانەیی/ دوئالیسم/ رۆنراون. بە پێی ئەو بۆچوونە هونەر یەکیەتی دەخاتە نێوان دووانە لێکدژەکانی وەك: ورد و درشت . عەقڵ و خەیال ، یاسا و زۆرە ملی و... جیهانی نواندن و ئازادی کردەوەی مرۆڤ باوەکو لەگەڵ هونەردا دژایەتییان هەیە، هەر پێکەون و رەنگە یەکیش بگرن.

چەمکی ئەزموونی جوانناسی، کە دەکەوێتە نێوان دوو پانتای رووداوی بابەتی /عەینی/ و ئەخلاقییەوە، چەمکێکی زیهنییە. جوانی لە پێشکەشکردنی چێژێك بە هەست یەکجار سەرترە بەڵام بە سەر ئەوەشدا جگە بە جۆرێکی گشتی پێناسە ناکرێ، بۆ وەی ناچێتە ناو هیچ چەمکێکی تایبەتەوە بە بێ هیچ زانستێ دەرکدەکرێ، بەڵام خۆی

پلەی زانستەکان دەباتە سەرەوە. ئەو رازیبوونەی بە هۆی ئامادەبوون و دەرکیجوانی بە مرۆڤ دەگا، ئاکامی کارلێك/ تەعامولی / هەست و عەقڵە. چەمکی جوانی لای کانت بە سەر لایەنی رووخسار و رازاندنەوە و جوانسازی و دەرهەستبوونی شتەکانەوە بەندە بەو بۆچوونە هێڵکاری پێچەڵاوپێچ و خەیاڵاوی و نەقشی بڕگە بڕگە و موسیقای بێ شیعر و( لەوانەش تەعبیرێکی شاعیرانەتر کە هی نالی بێت بیدی مەجنوونە )... ئەوەی کە هیچ چەمکێ نەدەن بە دەستەوە، دەبنە جوان و جوانین.

هنر امروز سروش جیبی امیرکبیر 1354 . ل 15

کانت چەمکی / ئیعتباری بابەتی/ بۆ ئەو داوەریانە دادەنێ کە زانستی و مەنتقین و بڕوای وایە کە ئێمە لە داوەری جوانناسانەدا ئەسڵەن کارمان بە سەر شتەکەوە نیە بەڵکو کاری قووڵبوونەوە و تێرامانە لە سەر جوانییەکە ..

دوای خوێندنەوەی شیعرەکەی نالی و رای کانت لە مەڕ جوانناسی و دەسەلآتی مەعریفی و جوانی، لەرێوە تێدەگەین ( ئەگەر شیعرەکەمان باش وەرگرتبێ) کە هەردووکیان یەك بۆچوونیان هەیە و ریشەی فیکری و نەزەری و زیهنی هەردوولا سازکردنی تەبایی نێوان عەقڵ و هەستە لە سەر جوانی و هونەر، کانت باسی هەموو ئەو شتانە دەکا کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی شەر و خێرەکەی جوان دەنوێنن و نالی خوازەی بیدی مەجنوون بۆ ئەو مەبەستە دێنێتەوە کە بەسەر ئەو هەموو جوانی و رازاوەییەیدا بەر و تەنانەت سێبەریشی نییە..

**بیدی مەجنوونە وجوودم لە هەمووبەر بەرییە**

**نە کەسێ مونتەفیعی یەکبەری یان سێبەرییە**

کانت باسی دەسەلآتی مەعریفی دەکا کە دەکەوێتە نێوان عەقڵ و هەست بە جوانییەوە و نالیش وەك رێبواری رێی مەعریفە خوێ لە نێوان عوقەلا و پەریدا دەبینێ " لایەك هەم و پەرێشانیی و دەردیسەری و باری تەکالیفی روسوومی بۆ خەڵك ( کە نووسەرێکی فارس «موسیبەتی نویسەندەبوودەن »ی پێدەڵێ) ولایەك پەری و جوانی بیدی مەجنوون و کاکۆڵی سەر و موویی میان و..تاد.

**بە ریا باری تەکالیفی روسوومی بۆ خەڵك**

**چ دەکێشی ئەمە حومقێکە عەلاوەی کەرییە**

لەزمانی خەتابی شیعر بەنالی یان عوقەلا بە نالییەوە کە مەبەستەکە ناگۆڕێ موتمەئین‌خاتر و ئیمەن مەبە هەرگیز لە شەڕی نەفسی ئەممارە کە ئەم مارە لەگەڵ تو شەڕییە.

کانت باسی هەستی چێژ و رەنج دەکا لە جوانی و والادا و نالی دیسان لە خوازەی بیدی مەجنووندا ناڕاستە و خۆ باسی چێژ و لە خوازەی کاکۆڵی سەردا راستەوخۆ ئاماژە بە هەم و پەرێشانی و دەردیسەری و لە راستیدا رەنج دەکا"/ هەر ئەوەی کە کانت وەك سەرك جوان یان «والا» باسی دەکا و لای وایە شتی جوان چێژدەرە بەلام مرۆڤ لە بەرامبەر شتی «والا»دا هەست بەبێدەسەلآتی و سەرسامی و رەنج دەکا:

**چـــــیت لە کاکۆڵی سەر و موویی میانی داوە**

**هەموو هەر هەم و پەر’شانی‌یو دەردی سەرییە**

کەوایە دەبینین کە نالیش جوان و سەرك جوان لێك جوێ دەکاتەوە ولەم شیعرەدا کاکۆڵی سەر و موویی‌میانی پەری شیعر بە سەرك‌جوان یان «والا» دادەنێ و لە بەرانبەریدا هەست بە هەم و پەرێشانی و دەردیسەری یان رەنج دادەنێ. ئەمە رەنگە پرسیارێکی

سەرەکی نەبێ کە چۆن کانت و نالی یەکیان گرتووەتەوە؟ بۆ وەی فرۆید لای وابوو کە شاعیران هەر لە ئەزەلەوە رەوانناس(و بە بۆچوونی من جوانناس) لە دایکدەبن. بەلام رەنگە ئەمەتان لا گرینگ بێ کە چۆن ئەو باسە دوور و درێژەی کانت کە لە دووتوێی کتێبێکی سەنگینی وەك « رەخنە لە هێزی داوەری »دا هاتووە، نالی لە پێنج دێڕی شیعریدا ( و بە شێوەیەکی جوانتر) ئاراستەی خوێنەری چالاکی دەکا؟

وەلامی ئەم پرسیارە ناراستەوخۆ لەخزمەت پێکهاتەی مانایی و زیهنیی شیعرەکەدایە: نالی بەزمانی شیعر قسەدەکا کە هونەری والایە و لە گەلْ نووسینی ریسالە و مەنتەقییات زەوی تا کاکێشان جیاوازە و دەمانخاتە تۆڕی هەم و پەرێشانی و دەردیسەرییەوە ... وەلامی ئەو پرسیارەی سەرەوە دەسەلاتی زمانی شیعرمان بە جوانی بۆ ڕووندەکاتەوە . ئەگەر وەك نالی زۆر بەکورتی و شاعیرانە بمانهەوێ وەلام بدەینەوە، دەبێ بلێین : بۆ ئەوەی نالی شاعیر بوو.

## ویتگونشتاین و یارییە زمانییەکانی نالی

**وەرە سـەیری خـەیابان و بەیازی دەفـــــــتەری نالی**
**کە سەفسەف مەسرەعی بەرجەستە، ڕیزی سەروی مەوزوونە**

عەزەمەتی نالی جگە لەوەی باسکرا ( ڕوانینی نوێ و ئانارشیزمی شاعیرانە ودیاردەناس ..) لە باری سەبکی شیعرییەوە دوو لایەنی سەرەکی هەیە:

1. وشە بە نیشانەی وێنە، واتە هەر وشە و ئیماژێکی نالی بۆ بەرجەستەکردنی وێنە و سیمایەك ڕەسم دەکرێ و لەخوێندونەوەی هەر بەیتێکدا هەست بە / دیتنی/ فیلمێکی سینەمایی دەکەی ... تەنانەت وشەکان لەم بەشەدا وشەگەلێکی بەرهەستن و دوورن لە ئینتزاع و تارمایی میتافیزیکی، سەیری خەیابان، بەیازی دەفتەری نالی، سەف سەف، مێسرەعی بەرجەستە، سەروی مەوزوون . هەموویان بە جیا جیا دەبینرێن و هەست پێدەکرێن و کاتێ ئاوێنەی یەکیش دەبن خوێنەر هەست ئەکا بەیازەکەی نالی لە بەر دەستدایە و لێیدەڕوانێ ... بەرامبەریی بەیتەکان لەگەڵ یەکدی بوونەتە شەقام و سەروی مەوزوونی چەند پاتبوونەوەی ( ئا ) کانی دێری یەکەم, چوار جار لە بەیتێکدا، هەڵکشانی سەروی سەرشەقامەکان دێننە بەچاو....

( لەم ڕوانگەوە بڕواننە وتاری ( نالی شاعیری مانا ( بەڕێز عەزیز ئالی لە سەر شیعرە بەرزەکەی نالی دیسان لە بگرە بەردەیی گوڵچین و باخەبان و من درێژدادڕی ناکەم تەنیا دەڵێم دەبوا ناوی ئەو وتارە نالی شاعیری وێنە بوایە بۆ وەی وتارەکەش هەروا دەڵێ ...

2. زمان وەك كەرەسە و كاركردی نیشانە لە شیعردا بەرجەستە دەبێ وئەوەندە سرکە کە خو بۆ مانایەکی سەرەکی نادا بە دەستەوە. لەم شیعرەدا نالی بە وشە یاری دەکا و وشەکان بە ئێمە یاریدەکەن و ئەو دەورە هەر درێژەی هەیە ...

**بـــێ بابیی تۆ بۆ من و تۆ بابی فتووحە**
**بێ بابیی تۆ خواستەیی من بوو بە ئاوات**

لەو شیعرەدا ئەوەند بە وشە یاریکراوە کە بەڕاستی بازنەی مانایی باب پەرەدەستێنێ و لە مانایەکەوە دەچێتە مانایەکی تر... نالی دەیان و ڕەنگە پتر نموونەی وای هەیە کە لە درێژەی وتارەکەدا باسی ئەکەین.

وێتگونشتاینیش لەو فیلەسووفە ڕۆژئاواییانەیە کە لە سەر پرۆسەی یاری زمانی کاری کردووە و هەموو کردە کۆمەلایەتی و تەنانەت هونەرییەکانیش بە لەونێ دێنێتەوە سەر یاریکردن بە زمان. زۆربەی فیلەسوفان و ڕوناکبیرانی جیهان تەوەرەی ( یارییە زمانییەکان ( بە هی ئەو ئەناسن. وێتگونشتاین ئەڵی: یاساکانی هەر یارییەك وەستاو نینە و بەردەوام لە گۆڕاندایە، ئەگەر یاریزانێکی بە توانای تۆپی پێ هەبێ کە بتوانێ کیلۆمەترێ تۆپێك شووت بکا دڵنیابن هەموو یاساکانی تۆپی پێ دەگۆڕدرێ. ویتگونشتاین لە دوو دەورەی فیکریی خۆیدا، دوو جۆر ئاوڕی لە زمان دایەوە:

**یەکەم**: لە ( نامیلکەی مەنتیقی فەلسەفی )/ لە کارە سەرەتاییەکانی / لای وابوو زمان تەنیا لە ڕێگەی وێنە و وێنەسازیدایە کە مانا پەیدا دەکا و مرۆڤیش تەنیا لەو ڕێگەوە فێرە زمان دەبێ کە بۆ هەر وێنەیەك شتێ

دێنێتەوە بیر خۆی ... لە ریسالەدا زمان تەنیا وێنەیەکی واقیعە و بەس. هەموو زمانەکان بنەمایەکی مەنتیقی و هاوبەشیان هەیە و ... تاد.

ئەگەر ویتگونشتاین ئاشنای زمانە رۆژهەڵاتییەکان بوایە دەکەوتمە گومانەوە کە ئەم بۆچوونە و بۆچوونەکانی دوایی کە لە توێژینەوە فەلسەفییەکاندا باسی دەکا و ( لە درێژەی وتارەکەدا باسی ئەویش دەکەین ) هەردووک لە نالی وەرگرتووە .. بەڵام دڵنیام ویتگونشتاین زمانی کوردی نەزانیوە.. هەرچەند ئەگەر زمانی کوردی خوێنەری باشی هەبوایە ئەیتوانی ئەو بیرۆکەیە لە نالییەوە بگا بە ویتگونشتاین- ئەوەش گرینگ نییە کێ لە پێش .. گرینگ ئەوەیە نالیش لە سەر ئەو بڕوایە بووە کە زمانەکان بنەما و ساختارێکی هاوبەشیان هەیە و دەتوانن لە پاڵ یەکدیدا پەرە بدەنە جیهانی وێنە و ئافراندنی هونەری، گرینگ ئەوەیە نالی وەك لە هەموو دیوانەکەیدا بەرچاوە لە هیچ وشەیەك نەپرینگاوەتەوە و ئەو وێنانەی خۆلقاندوویەتی، ئەو باوەڕەش دەسەلمێنێ کە ئەو لای وابووە وشە دالێکە بۆ مەدلوولی وێنە و تەسویر لەجیهانی واقیع:

**لادە دسرۆکەیی هەوری لەجەبین**
**دەرکەوێ شەمس و قەمەر، نوور و چیا**
**لێوی تۆ ئـــاوی بەقا من خزرم**
**فـــــەیزی تۆ رەحمەت و من سەوزەگیا**

**دەخـــیلت بم نەخیلی یا روتـابی**
**وەهـــــــــا شیرین و سینە نەرم و دڵڕەق**

**سایەیی پایە وەکو بالی هوما بازی سپیم**
**نەوەکو بوومی قەدەم شووم و نە هەمڕەنگی قەڵەم**

ئەم وێنە واقیعییانە / بەزمانی ئەمڕۆ ناتووراليستانەی/ نالی کە هەوڵیداوە وەك کامێرایەکی فۆتۆگراف وێنەکان بقۆزێتەوە لە دیوانەکەی نالیدا کەم نین/ بڕواننە باسی کەرەکەی/ یا:

**دەورانییە وەك هێڵەکی سەوداسەری گێژم..**

شوبهاندنەکان وێنەیەك رەسمدەکەن کە مرۆڤ بە هاسانی بتوانێ بیهێنێتە پێش چاوی خۆی:

**سەری فەرهادم و دەندووکی قوڵنگ**
**دەستی مەجنوونم و دامێنی چیا**

**مۆژەت قوللابییە هەم شیر وهەم تیر**
**برۆت میحرابی‌یە هەم تاق و هەم جووت**

لەم بەشەدا حەتم دەبێ ئاماژە بکرێتە نامە بەناوبانگەکەی نالی کە گوایە بۆ سالمی نووسیوە / من پێم وا نییە راست بێ *[*]* / لەو شیعرەدا کە نالی بە پێی نۆستالۆژی و باری دەروونی و غەریبایەتییەوە نووسیویە بە دوو شێوە کامێراکەی خستووەتە کار و لە هەر کام لە دیاردەکان دوو وێنەی دژ بەیەکی خۆلقاندووە. سەبارەت بەو نامەیە زۆر نووسراوە و من لێرەدا زۆری لە سەرم نارۆم، تەنیا ئەوە

---
[*]. سروە ژمارە 170 لاپەری 16

به پێویست ئەزانم کە ئەو نامە بە ڕای من قوناخێکی تێپەڕینە بۆ وەی نالی بەو قەناعەتە بگا کە وشە دەسەڵاتدارە نە جیهانی واقع، واتە وشە و کارکردی وشە لە پانتایی جیهانی/ دەق /دا وەك ( موزەی شەترەنج وایە کە بەدەست خوتەوە چۆن یاری پێبکەی ) لەو نامەدا نالی هەر ئەو حوجرەی کە کاتی خۆی بە پێی بڕوایەکی ناتورالیستی فۆتۆگرافی دەکا:

وەك قەفەس ئەم حوجرە کۆن تێیە کە واگرتوویە ئاو
تـــــــار و پۆیی عەنکەبووتە زۆرە لێی کردوومە داو
دوودی ســەر میچی گوڵەنگی لەتلەتی دەسترازە کـــۆن
بـــان و دیــــواری بە میسلی لانکی ئەجزا شــــــکاو

لەو پلانەدا ئەو حوجرە ئەوەندە ناخوشە کە بە ڕاستی جێی ژیان نییە بەڵام هەر ئەو حوجرە و بەرجەوەندە لەنامەکەیدا دەبێتە غاری یار و عەبیری سەلامی بۆ واصیل دەکا:

مەیلێ بکە لە سەبزە دەرختانی مـــــــەدرەسە
ئـــــەوراقیان مـــــۆقەددەمەیی شینە یا نەسوور
حـــــــــەوزی پڕی کە نائیبی دیدەی منە لەوێ
لێڵاوی دا نـــــــــەهاتووە وەك سەیلی شێوەسوور
ئێستەش کەناری حەوشە کە جێی باز و کەوشەکە
یـــــاری تیایە یا بـــــــووەتە مەعرەزی نفوور
چـــــاوی بکە لە ســــــەبزە و سیرابی دائیرە
جێ جیلوەگاهی چـــــــاوەکەمە نەرمە یا نە زوور

نالی لێرەدایە کە تێدەگا زمان ئێجگار لەوە دەسەڵاتدارترە کە تەنیا وێنەی واقیعی پێ بکێشرێ. کام یەك لەو وێنانە واقیعن" ئەوەی کە ئەو حوجرە کۆنە بە ڕاستی جێی ژیان نییە. یا ئەو غاری یارە بەو بەرجەوەندە خوشەوە کە لە نامەکەیدا باسیکردووە.

لێرەدا دیسان دەچێتەوە سەر وێتگونشتاین:

ویتگۆنشیتاین ( لە توێژینەوەی فەلسەفی )دا ڕەخنە لە بۆچوونەکانی پێشووی خوی / وەشە وەك وێنە / دەگرێ و دەڵێ: بە ڕاستی وشە چییە؟ ئەو پرسیارە وەك ئەوە وایە بپرسن مۆرەیەکی شەترەنج چییە؟ ئێمە بەردەوام ئەپرسین مانای ئەم وشە چییە؟ بەڵام لە ڕاستیدا پرسیارەکە بە شێوەی ئەسیح ئەبێ ئەمە بێ: ڕوونکردنەوەی مانای ئەم وشەیە چۆنە یا / مانای ئەم وشە چۆن ڕووندەکرێتەوە /

واتە دەبێ بپرسێن لە کامە زەمینەی عەمەڵی / کارکردی/ و واقیعیدا ئەم وشە خاوەنی چە مانایەك دەبێ؟ چ شتێ ژیان ئەداتە ئەو دەنگ و نیشانانە کە زمان سازیاندەکا؟ بۆ خۆی وەڵامئەداتەوە" کەڵك، کارکرد، ژیانی پڕ هەڵسوکەوت ویتگونشتاین ئەڵێ: ( زمان مەنتیقێکی سەرەکی نییە بەڵکو لە مەنتیقەگەلێ بێ ئەژمار ساز بووە چۆنیەتی کەڵکوەرگرتن لەم مەنتیقە بێ ئەژمارە سازبووانە، چۆنیەتی کەڵکوەرگرتن لەم مەتیقە بێئەژمارانە یاریگەلی زمانی سازدەکەن ) زمان تاق نییە بەڵکو پێکهاتەی کۆمەڵەیەك /بە وتەی ئەو کولیکسیۆنی / یاری زمانییە. ئێمەش کاتێ لە مانای دێڕێك دەگەین کە شوێنی /

نەقشی/ ئەو دێرە یا وشەگەلە لەیارییە زمانییەکاندا بناسینەوە و لە یارییەکانی تر جویێی کەینەوە[*] .

ویتگونشتاین هەروەها دەڵێ: « چۆنیەتی ژیان وەزعی یارییە زمانییەکان روونئەکاتەوە . کەوایە زمانی تاقەکەسیمان نیە[**] .

نالی ئەو یاریزانە بوو کە تۆپی وشەی لە کیلومەترێ زیاتر شووت کرد و یاساکانی زمانی پێ گۆڕا. نالی پێشتر لە ویتگونشتاین بەوەی زانی کە وشە و / زمان/ لە یاریکردنایە کە ئەتوانی مانایەك بکاتە چەند مانا و فرەمانایی بەرهەمی فورمی یارییە زمانییەکانە و بەس . ئەوە چۆنیەتی ژیانی نالییە کە کارکردی زمانەکەی نالیش دەگۆڕێ — نوستالۆژی و خەمی غوربەت و دەربەدەری حوجرە ناخۆشەکەی نالی دەکاتە بەهەشت...

نالی زوو بەو ئەنجامە گەیشت کە هونەر و شیعریش بریتییە لە یاری زمانیی، یاری بە وشە و وشەئاراییش هەر لە خۆی دەوەشێتەوە. لەو لاوێکە لەو لاوە بۆئەم لاوە کشاوە . هەر سێ لاوە کە ئەتوانێ مانای جیاوازی هەبێ جەوان، گول، لایەن/ ریگەم بەسراوە (کە) دەچم رێم بەسراو/ خوێنەر لە نێوان سەراب و بەستراودا دەخولێتەوە و ناشتوانێ بڕیاری تەواو بسەپێنی بە سەریا:

**خەتات فەرموو کە خۆشە چین و ماچین**

**کــە نا چین خۆشە چینی چین و ماچین**

---

[*] . ویتگونشتاین خۆی گوتوویە زمان وەك وێنەی لە ئاکویناسی قەدیسەوە وەرگرتووە.

[**] . ئەم وتارە بەشی دووهە, لەوتاری چوار بەشی نالی و خوێندنەوە نوێکانی سەردەم بوو کە بەشی یەکەمی / نالی و دیاردەناسی / لەکونگرەی نالی سەقز 1380 خوێندرایەوە

ئەم یاریگەلە جگە لەوەی هارمۆنیای دەنگدانەوەی ماچ، بەهاوردنەوەی شەش چ ئەزرینگێتەوە مانای خوشەکەش بەرینترین دەکا و ... تاد

**شەوی بــەهاری جــوانی خەوێ بوو پڕ تەشویر**

**لە فـــەجری پاییزی پیری بــەیانی‌دا تەعبیر**

**مرووری نەکسە کە عەکسی قەمەر دەکا بە رەمەق**

**زەبوولی نیکسە دەگێرێ کە عــەکسی ریش بە شیر**

ئەو یارییە لەنێوان شەو، فەجر، بەهار, پاییز, جوانی، پیری . خەو, بەیان، تەسویر، تەعبیر..دا دەکرێ پانتایی مانا لە دێڕێکەوە دەکاتە دەفتەرێ .. راستی؟ ئەم شیعرە رەخنەگرتنەکەی ویتگونشتاین لە خۆیتان بیر ناخاتەوە؟ — مرووری نەکەسە کە عەکسی قەمەر دەکا بە رەمەق — کەوایە وشە تەنیا بۆ وێنەسازی لە واقیع نییە بەڵکوو کزی و بەهێزی ئێمە لە ژیاندا ئەتوانێ رەمەق بکا بە قەمەر یا بە پێچەوانە ریش بە شیر / ئەگەردەسەڵاتدار بێ/ و شیر بە ریش /زەخم/ ئەگەر کز و پەککەوتە بین.

کەڵك، کارکرد، ژیانی پڕ هەڵسوکەوتەکەی ویتگونشتاینتان لەبیرە/ ناڵێم ئیلاو بیلا ویتگونشتاین لە نالی وەرگرتووە، بەڵام بە فەرموودەی نالی ئەوە دەسەڵاتی زمانە کە ویتگونشتاینی کردە خاوەنی شیر و تێئۆری یاریگەلی زمانی بوو بە هی ئەو ریش وەمەرارەتێش ماوە بۆ نالی، ئەگینا دەبوا نالی شیر بەدەست بوایە و ویتگونشتاین بە کوڵێ ریشەوە... بۆ وەی زۆر دوای نالی ئەوانەی گوت رەنگە هێندی لە رەخنەگران بڵێن ئەو یاریکردنە بەس بەشێ بوو لە

یاساکانی/ قاعده/ شیعری کلاسیکی وەکو تەزاد و /دژایەتی/تەناسوب/ ڕێژە/ و تەوریە/ دوو مانایی/ و کینایە و خوازە/ ئیستیعارە/ لەف و نەشر – وەڵامدانەوە / لە تافەت و تەشبیە و مەتلوب و جیناس بە هەموو جۆرەکانیەوە و تەلمیح و ... تاد، ڕاستە بەڵام نالی بەراستی تۆپەکەی ئیجگار زۆر شووت کرد و ئەو یاسایانەشی گۆڕی . نالی بە سێ زمان و پتریش یاریدەکرد" هەر بۆیەش یاساکانی یارییەکەی ئەوەندە بەرینکردەوە کە هەر وشەیەك ویتگونشتاین گوتەنی" تەنیا لە ڕێگەی کارکردییەوە ئەیتوانی لە زنجیرەی بێکۆتایی دالەکانی خۆی پەرییبێتەوە . بۆ وینە لە شیعرە بەناوبانگەکەی مەستوورەدا" هەر تەنیا لەو شیعرەدایە کە ئێمە بە دوای مەدلوولێکیکەدا دەگەڕێین بۆ جەواب و گرێ و بیکر و شەرح و بەمەستوورە و ئاوێنە و دوڕڕی سەما و کانی بەقا، قوببە، ئەستوونە مشتی مەلا، پەڵە بەفر، قەندیلی مونیر،گوزەری ئاب و هەواکانی، ڕێواس، غونچەی نەشگوفتە . قورسی نەمەك، گڕی نەمەکین، سەنعەتی مانی، دورجی موجەوهەر، خرچی مودەوور، شەمامەی تەڵا ... شاریح و جاریح وموۆُزیحە گوشا و... تاد، ئەگینا هەر کام لەم وشە و وێنانە لە دەقێکیکەدا دەیان کارکردی تریشیان بێ هیچیان ئەوە نییە کە نالی لە مەستوورەدا مەبەستی بووە و ڕەنگە هەر مەبەستیشی نەبووبێ و ئێمە بە پێی کارکردی وشەوە ئەیسەپێنین بەسەر دەقەکەدا – ئەگەر بۆ پێناسەی شیعر وەك یاریی زمان لای نالی نموونە بێنینەوە دەبێ زۆربەی دیوانەکەی لێرەدا بخوێننەوە و بنووسینەوە/

جەسارەتی نالی تەنانەت لە وشەسازی و نامۆ کردنەوەدا ئەوەندە زورە کە ئێستاش ڕەنگە نموونەی نەبێ ئەو زاناندمان بەکاردەبا ...هەڵگڕا دێنێتەوە و دەیان نموونەی تر بۆ هارمونیای دەنگدانەوەی پیتەکان و سازکردنی کێشی ناوەکی / دەروونی/ یارییەکەی گەیاندووەتە ئەوپەڕی خۆی: ئاسکی ناسك بە باسك، ڕووسپی چەند ڕووسیان، ئاە و ئاهوو . ئاهۆ و باهوو، نە دەمت بوو نە دەمت بوو لەدەمت بوو، ڕووتم مایلی ڕووتم ، زوو ئەم ئاوە ڕژاوە – هەزار، هوزار، ئینشان و نیشان و نێشان، لە هەموو بەربەرییە، وابە ستەو پەیوەستە/ بۆ زۆڵف وبرۆ/ بەبێ مەی مەستە بێ مەی مەستە.. شەمامەی وەك شەمامەی، سەدای نەی دێ سەدای نەی دێ سەدای نەی. تاد ... لە هەرکام لەم تەرکیبانەدا تەنیا مۆسیقا دەور ناگێڕێ بەڵکو یارییەکە فۆرمێ تایبەتیش بۆ وشە سازدەکا کە لە مانایەکەوە بۆ مانایەکی تر بخزن وخو نەدەن بە دەستەوە و نەزانی بێزارە سەحێحەیان بێ زارە – فەرق سەحیحە یان فیرق / ناوچاو/

**خاو و بێخاوی دوو زۆڵفی خـــــــــاوم ئەز**

**حەرەکاتم سەکەنات و سەکەناتم حەرەکات**

ئەزانم ئێستا سەری ئێوەش دەورانییە وەك سەری سەوداسەری نالی... بەڵام ئەوە یارییەکە نالی کردوویەتی، هەرچەندە سەری خۆشی پێگێژ بوو بێ.

ئەوە ئاکامی هونەرە و گەمەکردنی زمان و ڕەنگە لە هەموو کەس نەوەشێتەوە بو وەی خۆی گوتەنی:

**زاهیز و باتین لە سەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز**

**ئاشنای سیڕی قەڵەم بێ غەیری نالی کەس نییە**

***

# بنەماخواز و خوێندنەوەی دەق

بنەچەکی بنەماخوازی زمانناسی نوێیە، ( سوسۆر ) یەکێ لە بناغەدانەرانی زمانناسی نوێ، یەکەم کەس بوو کە جیاوازی خستە نێوان ( گفت ) و ( زمان )ەوە و دواجار ( مارتینە ) زمانناسی فەرانسەیی بەمشێوە باسی ئەوجیاوازییە دەکا: ( پێویستە بە وردی جیاوازی بخەینە نێوان دیاردە جۆربەجۆرەکانی زمانناسی بەو جۆرەی کە لــە دێرێکدا روو ئەدا /لە لایەك/ و دیاردەی زمانناسی تایبەت بەو کەسەی هەوڵی پێوەندیگرتن ئەدا / لە لایەنێکی ترەوە/ )

زمان گەوهەرێکە، ئەو تواناییەمان ئەداتێ کە هەر کام لە ئەزموونەکانی خۆمانی پێبگۆزینەوە لای کەسانێ دی. زمــان بە کەرەسەی گفت/گفتار/دێتە مەیدانی دەربڕین . جیاوازی دیکەی زمان و گفت دەکرێ بە وشەگەل رەمز و پەیامیش دیاری بکرێ.

زمان سیستەمە، واتە بریتییە لە کۆمەلێك نیشانە... بەڵام گفت پەیامە، رەمز کۆمەلێك نیشانەی سازکراوە کە مەیدان ئەداتە نووسینی پەیام و بۆ تێگەیشتن لە مانای ئەو پەیامە دەبی هەر کام لە نیشانەکانی بە کۆمەڵێك رەمز هەڵسەنگێنین . کە وابوو رەمز کۆمەڵێك نیشانەیە کە بەپێی هێندێك یاسای تایبەت سازبووە، بەڵام ئامانجی پەیام پێوەندی سازکردنە و بەس. هەرپەیوەندییەکیش بەردەوام هەڵبژاردنێکی لەگەڵە، واتە هەر بێژەرێك لە خەڵکی ئاساییەوە بگرە تا شاعیر و نووسەر و سوخەنڕان، بە دڵخواز هێندێ لەو نیشانانە هەڵدەبژێرێ و بەپێی یاسایێك رێکوپێکی دەکا و دەیانخاتە یەك.. هەر بۆیە زمان کەرەسەیەکی گشتییە، بەڵام گفت /گفتار/ کارکردێکی تایبەتە.

به واتاییێکی فەننی تر گفت کاربـوردی  کەرەسەیەکی گشتییە.
/کە ئەویش زمانە/

بەم پێیە ( سوسور ) گفتی وەك خوڵقێنەر هەڵبژارد و وتەزایەکی دیکەی بەناوی بایەخی دەربڕین./ ارزشهای بیانی/  هێنایە گۆڕێ، بەڕای ئەو سۆزگەل مرۆڤ بەو بایەخگەلە دێنەدەربڕین.( بالی ) توخمەکانی( نووسینەوەی دەنگ ) / ئاوانویسی/ یشی هێنایەمەیدانەوە. ئەو رایگەیاند کە ئەو توخمانە لەسەر ( ماناى پەیام ) کاریگەرییان هەیە و ئاڵۆزی دەکەن. کەوایە دەکرێ دەنگیش وەك سیستەمێکی تر لە زمانناسی ( سوسور )ی بناسێنرێن .. ( بالی ) هەروەها جیاوازی خستە نێوان ( شوێن دانانی سروشتی ) و ( تەشکیلی )یەوە، واتە کاتێ ئەرك و زاتی زمان لەگەڵ سۆزی دەربڕین یەکگرن، شوێندانانەکە ( سروشتی )یە. وەك: ( ئاخ سەرم ... ئای پشتم .. لێرەدا کاریگەرێتییەکە، راستەوخۆ کاری وشەگەل ( ئاخ ) و ( ئای )یە . لەبەر ئەوەی هەست و زاتی زمان یەکیان گرتووە.

بەڵام کاتێ هەستی مە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە شێوەی ژیان و شێوەی هەڵسوکەوتمانەوە هەڵدەستێ و لە زیهنی مرۆڤدا لەگەڵ دیاردەکانی زمان پێوەندیدەگرن، شوێندانانەکە بە شێوەی ( تەشکیلیە ) بۆ وێنە:

**لاولاوە لە ئەولاوە بۆ ئەم لاوە کشاوە** نالی

لێرەدا شوێندانانی هەست لە ڕێگەی هۆکاری راستەقینە و سروشتی زمانەوە نییە. کە وایە لەبەرچی شوێندانانی ئەم هەستە قووڵترە؟ شێوازناسی/ سبك شناس/ بنەماخواز بە دۆزینەوەی پێنج ( ئا ) و چوار ( ل ) کە بە شێوەی هونەری لەو دێرە کورتەدا داڵبەخش بوونە باس لە شوێندانانی تەشکیلی ئەکەن .

وەنەبێ پێشتر کەس بەم شێوەی نەزانیبێ، زۆرێ لە شاعیرانی پێشووش ئەو ڕێگەیان رەچاو کردووە ودەقەکانیان ئەوە ئەسەلمێنێ.. بەڵام ئەمە پێشتر تێئۆریزە نەکرابوو ( رمبۆ ) هەوڵیدا خشتەی بەرامبەری دەنگ و رەنگ و هەستی بدۆزێتەوە یان ( رونەگیل ) شاعیری فەرانسەیی هەر بەو پێیە هێندێ بەرامبەری دەنگ و رەنگ و کێشی پێشنیارکرد . بۆ وێنە ئەو لای وابوو دەنگی کەمان لە گەڵ دەنگی ( ئی ) و رەنگی ئاوی لەگەڵ سۆز و حاڵ و خۆشەویستی .. یان دەنگی شمشاڵ و ( ئۆ )ی لە گەڵ حاڵ و سەفای بەهەشتیدا و ( ئا )ی لەگەڵ نارەحەتی جەستە و گیان و ... بەرامبەر دادەنا ئەم بۆچوونانە گەیشتە ئەوەی کە تەنانەت باس لە پێوەندی رواڵەتی وشە و ناوەرۆکەکەی بکرێ ( فرانسیس پۆنژ ) ئەیگوت: ( وشەکانتان لە نزیکەوە بینیوە؟ وشەیەك هەڵگرن ، باش وەیسووڕێنن و لە چەند لاوە باش لێیبڕوانن تا بۆخۆی دەبێتە ناوەرۆکەکەی ) ئەو وشەی کرۆش cruche / گۆزە /ی دایە بەر سەرنج و دیعایەی ئەوەی کرد کە هەموو پیتەکانی کرۆش شوینێکی گۆزە پیشانئەدا. کە وایە شوێندانانی تەشکیلی لەو بیرخستنەوانە سازدەبێ کە پێوەندی وشەکان یان پێوەندی و دەنگدانەوەی پیتەکان لەگەڵ ناوچەی کاربوردی/ نشانەهای کاربردی/ سازیدەکەن، سەرما و سەهۆڵی سەهەندە لە سەرما / زستان /
شین و شەپۆڕی شەوانە لە لەشما /هاوین /
خەمی خراپی خەزانە خزاوەتە رۆخـم

**نه باڵی بادی بەیانی**
**نە بۆن و بەرامی بەهاری**
**هەر زرتەزرتی خەزانی**
**هەر سرتە سرتی زسانی**

س ا | زە
سا | زە
ســـ | ز

ناوچەی کاربوردی لەم شیعرەدا/ س/ بۆ زستان و سەرما / ش/ بۆ هاوین و گەرما / خ / و / ز / بۆ خەزان و خشەخش/ ب/ بۆ بەهار و ئەهوەنی .. لەو ناوچانەوە هاتوونە.

یان لەم دێرەدا / دە لادە لادە لادە لەچکە کەسکە تەسکەکەت / ناوچەی خوازراوی/ ل / بۆ لەچك بەرچاوە و مۆسیقای دەنگدانەوەی/س/ پێوەندی نێوان کەسك و تەسك ساز دەکا. هەروەها بڕواننە ناوچەی خوازراوی / ر/ لەم دێڕەی مەحویدا:

جگەر دەبڕێ دڵ ئەڕفێنێت و دەڕوا چ بێمروەت چ بێپەروا چ بێباك باوەکو/ ر / لە هەموو ئەو وشانەدا بەجێ هاتووە، بەڵام تەنیا / بڕین / بە هۆی دەنگدانەوەی واقیعی ( بڕین ) ئەتوانێ شوێنی خوازراوی/ر/ بێ و مەحوی زۆر وەستایانە ئاوڕی لەو دەنگە داوەتەوە.

کە وایە شێوازناسی/ سبكشناسی/ دەبێ‌روونیکاتەوە کە دەربڕینی چ ناوەرۆکێ ئەتوانێ لە هەموو باسەکەدا رەنگبداتەوە، بۆ وێنە سەدان و بگرە هەزاران کەس بە تامەزرۆییەوە دەڕواننە هەڵچوونوداچوونی مانگ و دەڵێن «مانگ دەرکەوت» و.. بەڵام شاعیر

ئەو هەواڵە بە شێوەیەکی هونەری و بە رەنگوبۆنێکی تر و لەسەر بنەمایەکی پتەو ئەخوڵقێنێ:

**مانگی یەکشەو بۆیە داییم زیاد ئەکا و ئەشنێتەوە**
**تـا جوانـــی خـۆی وەکـو رووی تۆ بڕازێنێتـــەوە**
**تـا دەگاتە چواردەهـــــەم شەو تێدەگا ناگا بە تـــۆ**
**جا لە داخا نەختەنەختە کەم دەکا و دەکشێتەوە**

بڕواننە دەنگدانەوەی مۆسیقایی و هەروەها بازنەی وشەکان/ یەك، چواردە/ زیاد،کەم/ ئەشنێتەوە، دەکشێتەوە / ...کە چەند بەرێوجێ هاتوونە و جیاوازییان خستووەتە نێوان دەربڕینی ئاسایی ناوەرۆك و شێوە هونەرییەکەی. ئەگینا خۆ چ ئەو شیعرە و چ مانگ دەرکەوت و داکشا، یەك شت دەڵێن ...

بەم بۆنەوە بوو کە چۆنیەتی دەربڕین لە شێوازناسیی پێکهاتەخوازانەدا بەسەر کەمینەی ناوەرۆکدا زاڵدەبێ، واتە ناوەرۆکەکان بەردەوام دووپاتئەبنەوە.. بەڵام شێوازی دەربڕینی ئەو ناوەڕۆکەیە کە ئافرێنەرە یا نە؟ ئەو ناوەرۆکەی کە یاکوبسن پێیوایە لە رێگەی هۆکاری دووهەمەوە کە هەمان چۆنیەتی دەربڕین بێ دەخەملێ و دەچێتە خانەی هونەرەوە و حافز گۆتەنی:

**یك قێه بیش نیست غم عشق و وین عجب**
**از هر زبان که میشنـــوم نامکـــرر است**

لەمە بەدوا بەردی بناغەی شێوازناسیی پێکهاتەخوازانە دادەنرێ، لاب رۆیێر نووسەری سەدەی حەڤدە گوتبووی ( هەمووشتێ گوتراوە ) و ئاندرە ژید لە وڵامی ئەودا دەڵێ« بەڵێ بەڵام ئەوپەڕی بەنەوش / ماورا بنفش/ هێشتا ماوە.

ئەو پەڕی بەنەوش بە زمانێ تر هەر شێوە و چۆنیەتی کەڵکوەرگرتنە لە زمان، رەخنەگر ئیتر بۆ روونکردنەوەی دەق لە ژیان و کەسایەتی نووسەر کەڵکوەرناگرێ، بەڵکو هەوڵئەدا لە دەقەکەدا وە دووی زمان بکەوێ و یەکیەتی هونەری دەربڕین لە توێ توێکانی ناوچەی زماننناسیدا ببینێتەوە.

( فوسلێر ) بە هاوردنەوەی چەند نموونەیەك لە کێشی شیعری ئیتالیا و فەرانسە جەختی کردە سەر ئەوەی کە ( دابەزینی ڕواڵەتی لە شێوە باوەکانی کێش و مۆسیقای شیعر نە هەڵەیە و نە تەنانەت شوێن پەنجەی هەلومەرجە. بەڵکو شێوە دەربڕینێکی نوێ و وردبینانەترە )

واتە، لادانی( گۆران )ی خۆمان لەکێشی کلاسیکی شیعر نە بە مانای هەڵەکردن و نەزانینی کێشی شیعری پێشوو، بەڵکو شێوە دەربڕینێکی نوێ و وردبینانەتری شیعرییە کە بۆ ئەدەبی کوردی ئێجگاریش پێویست بوو و دەبێ بە شێوەیەکی دیکەش بخوێنرێتەوە:

**مەدەنییەت : گوڵی بەهاری حەیات**
**مەدەنییەت : هەوای نەشئو نوما**
**مەدەنییەت :وەسیلەیی ئەحیا**
**بۆ هەموو میللەت و عوومومی وڵات !**
**مەدەنییەت : ئەلەکتریك، قەمەر**
***ئەی زیابەخشی حاڵی نەوعی بەشەر!***

پێویست ناکا بۆ چوونە ناو ئەم دەقە شیعرییە سیر تا پیاز ژیانی مامۆستا گۆران و دۆست رەفیقەکان و... بزانین و بڵێین مەدەنییەت ئاساییە. بەڵکوو دەبێ جەخت بکرێتە سەر دەنگدانەوەی "وڵات" بەتەنێ لە نیوان ( حەیات و نوما و احیا ) لەسەرێ و قەمەر و بەشەر و .. لە خوارێ ... بۆ ئەوەی تێبگەین کە مامۆستا گۆران چۆن هەوڵیداوە شێوە دەربڕینێکی نائاسایی بنوێنێ.

هەر بەم پێیە ( فوسلێر ) روانییە قەل و رێوییەکەی لافۆنتین و بەجێی ئەوە لە رووی کەسایەتی ( لافۆنتین )ەوە شیعرەکە هەلسەنگێنێ لە رووی شیعرەکەوە کەسایەتی لافۆنتین و ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی پێشاندا. ئەو جەختی دەکردەسەر ( ئاغە ) قەل و ( ئاغە ) رێوییەکان و زنجیرەی توێژەکانی دیاریدەکرد و لە رووی زمانلووسی ئاغە رێوییەوە، کە لە شیعرەکەدا لەخوار ئاغە قەلەوە وەستاوە، تەماحی توێژەکانی تری ئەو زنجیرەیەی ئاشکرا دەکرد ...

لەو توێژینەوەدا ئەو هیچکات دیاردە لاوەکییەکانی دەوروبەری / وەك ژیاننامە و شوێنهەڵگرتن و میژوو .../ بەرچاو نەخست وئاوڕی لێنەدانەوە. ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە پێشتر بە پێی ناسینی کەسایەتی نووسەر و ژیاننامەکەی دەکرا ...

با وەکوو ( فوسلێر ) کارەکانی خۆی بە نیوەچڵ وێلکرد، بەڵام یەکێ لەقوتابییەکانی شێلگیرانە درێژەی بە کارەکەیدا و گوتی کە: ( هەر ئافرێنەرییەك دەکەوێتە بازنەییێکی وشەناسییەوە ) ئەو ئەڵێ: ( ئەو کاتەی من لاو بووم زمانیان بە میراتە تۆپیوی ئابا و ئەژدادی ئەزانی و

ڕێزمانی مێژوویش ئەلحەق هەموو هەستێکی تیا کوژرا بوو و ببووە چەند یاسایەکی وشکی دیاریکراو .. )

ئیسپیتزێر بڕیاریدابوو ئەرکی ڕەخنە بگوزێتەوە بۆ ناو دڵی دەق. ئەو بە ئاواتەوە بوو توێ ناوەکییەکانی دەق بپشکنێ و.. ئەدیبانی ئەوکاتەش بەئەنقەست سەریان بە ڕۆخی دەقەکەوە قاڵدەکرد. خۆی دەڵێ: ( ئەتگوت لێکدانەوەی ناوەڕۆك لە توێژینەوە زانستییەکاندا لاوەکییە ئەویش چ توێژینەوەیەك، توێژینەوەی ئەوان بریتیبوو لە دیاریکردنی وردی ڕۆژەکان و *ڕووداوە مێژووییەکان*، وەسوەسەی *نووسینەوەی* ژیاننامەی ئەدەب!! لەبەر چی؟ بۆ ئەوەی لایان وابوو کە شاعیر هەموو ئەو شتانە بەئەنقەست دەئاخنێتە بەرهەمەکەی خۆیەوە .. ) بەڵام تەنیا ئامانجی ئەوکارە، سەرەکی پیشاندانی کێشەلاوەکییەکان بوو و هیچی تر ( ئیسپیتزێر ) ئەڵی: ( فزوولیش بوو ئەگەر بتپرسیبا ئەو بەرهەمانە چۆن بوونەتە بەرهەمی هونەری؟ چییان دەربڕیوە و لەبەر چی ئەو جۆرە دەربڕینە لە فلاَنە دەورەی تایبەتی فەرانسەدا کەوتووەتە بەرچاو؟ )

بەگشتی ئیسپیتزێر لای وابوو ئەرکی شێوەناسی دۆزینەوەی رایەڵەی پێوەندی سیستەمی تاقەکەسی / شەخسی/ نووسەرە. ئەو رایەڵە لە ڕاستیدا شێوازی نووسین/ سبك /ی نووسەرە، ئەو دەڵێ: ( ڕەخنەگر دەبێ دەستی خوێنەر بگرێ و خۆحاست بیباتە ناو ئەو سیستەمە زمانناسییە سەرسووڕهێنەرەی کە رایەڵەی پێوەندییەکانی ئێجگار ناوەکییە، هەر لاڕێیەکی شێوەناسی لەگەڵ بژاڤێکی دەروون پێوەندی هەیە و شێوازکێشانی خشتەی ئەو بزاڤگەلەیە. )

ئەم بۆچوونە لە باری توێژینەوەی ڕەوانییەوە/ ڕەوانکاوی / لەگەڵ بووچوونەکانی ( فرۆید ) تەبایە، فرۆیدیش پیوابوو: ( نهێنی/ ڕەمز / هەر نەخۆشییەکی ڕەوانی لە بەکارهێنانی هێندێ وشەدایە، بۆ وەی وەسوەسەکانی مرۆڤ بەو وشانە ئەدرکێ. )

ئیسپیتزێر بەو پێیە لە ساڵی ( 1920 )دا دەقەکانی هانری باربووس ( barbuse )ی فەرەنسەیی خستە ژێر سەرنج و توێژینەوە و گرینگی وشەگەلی زام و خوێن/ کە بەردەوام لەگەڵ وشەکانی دەم و شەرمگەدا هاتبوون / ی ڕوونکردەوە. ئەو شرۆڤەکردنە لەسەر دەقەکانی شارل لوویی فیلیپ ( ch.l. philippe ) ئەو دەرفەتەی دایێ کە گریمانەی ( *بازنەی وشەکان* ) بێنێتە ئاراوە. ئەو پی وابوو زیهنی هەر نووسەرێك جۆرە ( مەنزوومەیەکی هەتاوییە ) کە هەمووشتێ دەچێتە ناو سووڕی جەغزەکەیەوە.

بە واتایەکی تر هەر دەقیك بازنەیەکە کە لە سەنتەرەکەیدا ناوکێکی گرانیکایی هەیە کە هەموو شێوە دەربڕینەکان بەرەوخۆی رادەکێشێ. ئیسپیتزێر بەردەوام لەدەور ئەو بازنەوە دەچێتە سەنتەر و لەوێوە دێتەوە بۆ دەورو بەری بازنەکە.. ئەو پێشنیاری کرد کە: ( سەرەتا بۆ دەستپێکی کار ئەو دەقەی مەبەستمانە بە وردی وەخوێنین بۆ وەی نامۆییەکی زمانناسانەی تیاببینینەوە، هەر ئەو نامۆییە ڕەنگە ببێتە هەوێنی سەرەکی بۆ دۆزینەوەی پێوەندییەکانی ناو دەق، ئەم جۆرە ڕوانینە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕەخنە لە دەقەوە سەرهەڵدا و پێوەرە دەرەکییەکان شوێنی ئەوتۆی لەسەر دانەنێن. ) ئەو ئەڵێ: ( بەرای من ڕوونکردنەوەی ماکێکی زمانناسی لە بەرهەمی نووسەرێکی

دیاریکراودا قازانجی لەوە زیاترە کە ناوەرۆکی شێوازەکان یا تایبەتمەندی زمانناسانە، ئێجگارەکی دیارییبکەین. بۆ وەی جیاوازی ئەندێشە پێویستی بە جیاوازی کەرەسەی دەربڕینە. ) بۆ وێنە بڕواننە ئەم دوو دەقەی خوارەوە:

1 . *یا ماری سەر خەزێنە بترسە کە کەژدومێ*

*بەو نووکە چزووە پڕ بە دەمت کا لە زەهری مار* مەحوی

2 ـ بەمن چی مار دوو پشك شەق کا

یا دوو پشکێ

مەردانە یا نامەردانە

ژاری رق بە مار بچێژێ

من بۆ گوڵێکی رەنگاڵە عەوداڵم و ....

کەرەسەی دەربڕین لەم دوو دەقەدا مار، کەژدم و ژەهر و... ن. بەڵام هیچ کام لە نیشانەکانی ئەم دوو دەقە نایێنەوە سەر مەدلوولیك.

| داڵەکانی دەقی یەك | مەدلوول/بەپێی راڤەکاری مەلاعەبدولکەریم |
|---|---|
| مار | پیاوی رژد و دەسەڵاتدار |
| کەژدوم | مەرگ |
| ژەهر | زەجری پێش مەرگ |

| داڵەکانی دەقی دوو | مەدلوول بەپێی راڤەی ئەم قەڵەمە |
|---|---|
| مار وکەژدوم | هەموو ئەو کەسانەی لەدەرەوی بازنەی عەشقدان |
| ژەهر | کەرەسەی خۆ خواردنی هەردوو لا |

شەڕی مار و کەژدوم لە دەقی یەکدا شەڕێکی رەوایە. شەڕی مار و کەژدوم لە دەقی دوودا شەڕێکی / دەسەڵاتدارانەیە لە هەردوو لاوە/ ناڕەوایە دژ بە عەشق.

هەر ئەمەش دەبێتە هۆی جیاوازی روانگەی ئیسپیتزێر و رەخنەی دەروونشیکاری. رەوانکارەکان نیشانەکان دەبەسنەوە بە مەدلوولێکی یەکجارەکییەوە و هەر بۆیە لە راڤەکاری دەقدا زۆرجاران تووشی هەڵەش دەبن...بەڵام ئیسپیتزێر وەك پێشتر ئاماژەکرا سەرەتا لە رێگەی خوێندنەوەی دەقەوە بە شهوودێك دەگا و کاتێ ئەو نامۆییە یەکەم ماکی ئاشکرای شێوازی دا بەدەستەوە لە مەحەکی لایەنە تایبەتییەکانی دیکەی/ بۆ وینە بازنەی وشەکان/ ئەدا و ئەوندە درێژە بەو کارە ئەدات تاوەکو لەنێوان رۆخ وناخی ئەو بازنەدا تەباییەکیروونئەدۆزیتەوە.

باوەکوو ئەم جۆرە شێوازناسییەی ئیسپیتزێریش زیهنییە و دواجار پێکهاتەخوازەکان لە روانگەی زمانناسییەوە عەبەسیەتی ئەو وتەزایانەیان پیشاندا و تەنانەت لە رەوتی بابەتی زمانناسانەدا دەستێوەردانی نووسەریشیان کەم بایەخ کردەوە، بەڵام هەر ئەوەندە کە جەخت ئەکرایە سەر زمان و بازنەی وشە و لارێیی و هەروەها دەق وەك کۆیەکی ئەمڕۆژی بوو بە هۆی گەشەکردنی رەخنەی نوێ. ئەو چەمکانە دواجار لەلایەن فورمالیست پێکهاتەخوازەکانەوە ئاوڕیان لێدرایەوە.

***